جواهر سنن أبي داود
بەکوردی
منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com
ئامادەکردنی
سیروان کاکە أحمد
وەرگێرانی
ستافی پیت

# جواهر سنن أبي داود

## بەکوردی

ئامادەکردنی: سیروان کاکە أحمد

وەرگێڕانی: ستافی پیت

هەڵەچن و ڕێنووس: بڕیار هێرۆیی

دیزاینی ناوەوە: بڕیار هێرۆیی

دیزاینی بەرگ: إخلاص دیزاین

چاپی یەکەم: ١٤٤٥ك - ٢٠٢٤ز

٥٢٣ لاپەڕە

٢٤ × ١٧ سم

بابەت: ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی (٢٩٦)ی ساڵی (٢٠٢٤)ی پێ دراوە

جواهر كتب الستة بەكوردی (١)

# جواهر سنن أبي داود

## بەكوردی

ئامادەكردنی

**سيروان كاكه أحمد**

وەرگێڕانی

**ستافی پيت**

پێشکەش بێت
بەهەر کەسێک
هەوڵدەدات هاوەڵی
پێغەمبەر ﷺ بێت
لەبەهەشت

## سیفەتەکانی و شکۆ و گەورەیی ﷺ

ئەگەر هەر یەکێک لە ئێمە بەهۆی سیفەتێک یاخود دوو سیفەت و ڕەوشتی جوان ڕێز و پێگەیەک لە دڵی خەڵک پەیدا بکات، ئەو یەک دوو سیفەتە ڕێزداری بکات، ئایا بۆچوونت چۆن دەبێت بەرانبەر ڕێز و پێگە و گەورەیی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە هەرچی سیفەتی شکۆ و مەزنی و گەورەیی هەیە، لە زاتی ئەودا کۆ بۆتەوە، وەک:

پلەوپایەی پەیام و پەیامبەری، خوللەت و مەحەببەت، پاڵفتەیی، شەوڕۆیی، مەقامی قوڕب، شەفاعەت، وەسیلە و فەزیلە، مەقامی مەحموود، بوڕاق، بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان، ڕەوانەکرانی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی، بەرنوێژیکردنی بۆ پێغەمبەران، شایەتی بۆ درانی لەلایەن پێغەمبەران و ئوممەتانیان، گەورەی هەموو وەچەی ئادەم، هەڵگری ئاڵای حەمد، ڕەوانەکرانی بەڕەحمەت بۆ هەموو جیهانییان، ڕازیکرانی لە قیامەت لەلایەن خواوە، حەوزی کەوسەر، نیعمەت و بەخشش بۆ تەواوکرانی[١]، چاوپۆشی لێکران و لێخۆشبوونی لەوەی پێشتر کردوویەتی و ئەوەیشی لە داهاتوودا دەیکات[٢]، سینە فراوانکرانی[٣]، ناو بەرزکرانەوە و شۆرەت پەیداکرانی، پشتیوانی لێکرانی بە فریشتەکان، حیکمەت و شەریعەت و فاتیحە و قوڕئان پێدرانی، صەڵاوات لەسەر درانی لەلایەن خوا و فریشتەکان، سوێندخواردن بە تەمەنی موبارەکی،

..............................

(١) ئاماژەیە بۆ ئایەتی: {وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ} يوسف: ٦.

(٢) ئاماژەیە بۆ ئایەتی: {لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ} الفتح: ٢.

(٣) ئاماژەیە بۆ سوورەتی (إنشراح).

وەڵامدرانەوەی داواکانی، قسەکردنی لەگەڵ بێگیان و گیانداران، هەڵقوڵینی ئاو لە نێوان کەلێنی پەنجەکانی، مانگ بۆ شەق کرانی، سەرخرانی بەترس خرانە نێو دڵی دوژمنانی، سێبەر بۆ کرانی لەلایەن هەورەکانەوە، تەسبیحاتکردنی چەو و وردەبەرد لەنێو لەپی دەستە موبارەکەکانی، پاراستنی لە زیانپێگەیاندنی لەلایەن خەڵکەوە ... شکۆ و مەزنی و گەورەییەکەی لە ئاستێکە هیچ کەسێک ناتوانێت وەک ئەوەی شایستەیە ئاماژەیان پێ بکا و یەک لەدوای یەک باسیان بکات. بەدەر لەو خوایە تاکوو تەنهایەی  پێی بەخشیوە و فەزڵی لەگەڵ کردووە، هیچ مرۆڤێک ناتوانێت پەی بە خەسڵەتە مەزنەکانی ببات و بەئاسانی درکیان بکات.

# چەند ڕێنماییەکی پێویست بۆ خوێنەری خۆشەویست

خوێنەری بەڕێز:

١. کاتێك فەرموودەکانی نێو ئەم پەرتووکە دەخوێنیتەوە بەخێرایی بەسەریدا گوزەر مەکە و بچیە سەر خوێندنەوەی فەرموودەیەکی دیکە، وە بیر لە مانای فەرموودەکان بکەوە و لە کاتی تێنەگەیشتن یان ناڕوونییەك بگەڕێوە بۆ سەرچاوەکانی ڕوونکردنەوەی فەرموودە، چونکە فەرموودە هەیە مانای ناڕوونە لە شوێنی دیکە ڕوون کراوەتەوە، فەرموودە هەیە بەکورت و پوختی هاتووە لە شوێنێکی دیکە تەفصیلی پێ دراوە، کە ئەم کتێبەت خوێندەوە بەجوانی لەو قسانە تێدەگەیت.

٢. پاشان بزانە فەرموودەکان بەزۆری وەك شیفا و چارەسەر وان بۆ نەخۆش یان بۆ هەر کەسێك پێویستی بەو دەرمان و چارەسەرانە هەیە، بێگومان چارەسەریش دەبێت کەسێکی پسپۆڕ لەو بوارەدا بۆ کەسی پێویست دیاری بکات، ئەگەرنا بەکارهێنانی فەرموودەکان بەبێ ئاگاداربوون لە زانستە شەرعییەکان، یان بەبێ پرس و ڕاوبۆچوونی کەسانی شارەزا، لەوانەیە خاوەنەکەی تووشی هەڵە بکات و سەرەنجام تووشی پەشیمانی ببێتەوە لە هەندێك کردار و گوفتار کە ئەنجامی داون بەهۆی هەڵە تێگەیشتن لە فەرموودەکان.

٣. تکایە بە هیچ جۆرێك فەتوا و بۆچوونی خۆت لەسەر ڕواڵەتی فەرموودەکان دەرمەبڕە، چونکە دڵنیات دەکەینەوە، بەبێ هەبوونی بنچینەکی تۆکمە لە زانستی شەرعی و گەڕانەوە بۆ زانایانی فەرموودە تووشی هەڵەی گەورە دەبیت.

لەگەڵ ڕێزدا

ستافی پیت

# پێشەكی

بێگومان سوننەت وەك سەرچاوەی دووەمی شەریعەتی ئیسلام زۆر جێگای بایەخ و گرینگیپێدانی موسوڵمانە، گەیشتن بە سەرچاوەكانی سوننەتیش كە لە سەرچاوە سەرەكییەكانی كتێبەكانی فەرموودە بەرجەستەیە، كارێكی ئاسان نییە، لە سۆنگەی هەستكردن بە بەرپرسیارییەتی و گرتنبەری ڕێگایەكی ئاسان بۆئەوەی موسوڵمانان لە هەر شوێنێكی دونیا بتوانن بەسانایی دەستیان بگات بە فەرمووەكانی خۆشەویستمان ﷺ و سوودی لێ وەربگرن و لە ژیانی ڕۆژانەیان كاری پێ بكەن، هەڵسام بە خوێندنەوە و كورتكردنەوەی هەر شەش كتێبی شەش زانا ناودارەكانی فەرموودە، بەڕێزان و پێشەوایانمان:

پێشەوا بوخاری و پێشەوا موسلیم و پێشەوا ئەبو داود و پێشەوا تیرمیزی و پێشەوا نەسائی و پێشەوا ئیبن ماجە (ڕەحمەتی خوای میهرەبانیان لەسەر بێت).

لەسەرخۆم كردە مەرج جگە لە فەرموودەی (صحیح) نەهێنم و تەنانەت خۆم پاراست لە فەرموودەی (حسن)یش، كە بێگومان لەلای زانایان كاری پێ دەكرێت (مقبولە)، بەڵام خۆپاراستنم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە نەكەومە نێو كێشە و ڕاجیایی زانایان لەسەر حوكمی زانایانی فەرموودەناس بۆ پلەی فەرموودەكە.

پاشان ناوم لێ نا (جواهر)، واتە: گەوهەرەكان، بۆ ئەوەی بواری ڕەخنە كەمتر ببێتەوە لە بەندە و لە كارەكەی، ئێمە بانگەشەی ئەوە ناكەین خوێندنەوەی هەر یەكێك لەو كتێبانە جێگرەوەی كتێبە بنەڕەتییەكە بێت، بەڵام دەتوانین بڵێین زۆرترین فەرموودەی (صحیح)ـی ناو ئەو كتێبانە دەرهێنراون بە شێوەیەك ئاسان بێت بۆ خوێندنەوە و لەبەركردن و ئاسانكردنی دەستاودەست پێكردنی كتێبەكان لەنێو خەڵكدا.

ئەوەی توانراوە هەوڵ دراوە و کراوە، ئەوەی نەکراوە داواکارم بە پشتیوانی خوا لە چاپەکانی داهاتوو بە پێشنیاری دڵسۆزانەی موسوڵمانان بتوانین پرۆژەکە باشتر و جوانتر بکەین و بەرەو پێشتری ببەین، کارێك بکەین شایستە بێت بە بێژە و پیت و وشە و ڕستانێك کە تێکهەڵکێشی هەناسەکانی ئەم زاتە پاکە موبارەکەن ﷺ.

لە کۆتاییدا دەمەوێت لە ناخی دڵمەوە سوپاس و پێزانینی خۆم ئاڕاستەی ستافی پرۆژەی (پیت) بکەم بۆ ئەو هەوڵ و کۆششە بەردەوامەیان لە خزمەتکردن و سەرخستنی ئەم پرۆژە موبارەکە و لە ناخەوە سوپاسی ئەو (محسن) و چاکەکار و سەربازە ونانەش دەکەم هاوکارمان بوون بۆ بەچاپگەیاندنی ئەم کتێبە ناوازانە و خوا بەباشترین شێوە پاداشتی هەمووومان بداتەوە و هەر خۆی وەرگری کردەوە چاکەکانە و پاداشتیش دەداتەوە، چونکە دڵنیاین کردەوەی باشی چاکەکاران زایە ناکات.

سیروان کاکە أحمد

هەولێر

٢٠٢٤\٢\٢ ز

## بەرنامەی کارکردنمان لەم پڕۆژەیە:

١. بۆ دەرهێنانی دەقی فەرموودەکان و ناونیشانەکان پشتمان بەستووە بە باشترین ئەو چاپ و نوسخانەی لەبەر دەست بوون.

٢. لە هەر شەش کتێب دەستکاری (کتاب) نەکراوە نە بە دەستکاریکردن و نە بە لابردن (حذف)، هەر پێشەوایەك لە نووسراوەکەی چەند (کتاب)ی وەك عینوان هێناوە دامانناوەتەوە وەك خۆی.

٣. سەرجەم فەرمووده (ضعیف) و (حسن)ەکانمان لابردوون، سەرباری لابردنی کۆی فەرمووده دووبارەکانی نێو کتێبەکان.

٤. هەر فەرموودەیەك (سبب ورود)ی لەگەڵ بوو بێت هێناومانە، ئەمەش لەپێناو باشتر تێگەیشتن لە فەرموودەکە و زووتر گەیشتن بە مەبەستی گوترانەکەی یان ئەنجامدرانەکەی، جا فەرموودەکە (مرسل) بووبێت، یان (موقوف) بووبێت، یان (مرفوع).

٥. بۆ وەرگێڕانی کوردییەکە سوودمان بینیوە لە کۆی کتێبەکانی پڕۆژەی پیت، بەڵام بەهۆی دەستکاریکردنی زۆری وەرگێڕانەکەوە نەمانتوانی ناوی هیچ وەرگێڕێك بنووسین، بۆیە لێرەوە زۆر سوپاس و پێزانینیان ئاڕاستە دەکەین و ئەوانیش خاوەنی ئەم پاداشتە نەبڕاوەن (إن شاء الله).

٦. لە دەقی عەرەبیدا هەر فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ بە ڕەنگی سوور نووسراوە و خراوەتە نێو دوو جووت کەوانەی بچووکەوە - « » -، بەهەمان شێوە لە واتا کوردییەکەشیدا خراوەتە نێو دوو جووت کەوانەوە و هەر بە ڕەنگی ڕەش نووسراوە.

٧. لەنێو وەرگێڕانە کوردییەکەدا لە هەر شوێنێك پێویست بە ڕوونکردنەوەی کورتی وەرگێڕ بووبێت، لەنێو دوو کەوانەی - ( ) - ڕەشدا ڕوونکردنەوە و شەرح نووسراوە.

٨. له هەندێك شوێن ڕوونكردنەوەی زیاتر پێویست بووە نووسراوە (تێبینی:) و له خوارەوە ڕوونكردنەوەكەی نووسراوە.

# پوختەی ژیانی ئیمام ئەبو داود رحمه الله

**ناسنامە:**

ئەو پێشەوایەی کە شێخی سوننەتە، سەرڕەوی هەموو حوفازەکانە، ئەویش ئەبو داودە، سولەیمانی کوڕی ئەشعەسی کوڕی ئیسحاقی کوڕی بەشیری کوڕی شەددادی، ئەزدی سیجیستانییە.

ئەزد: نیسبەتە بۆ ئەزدی کوڕی غەوسی کوڕی نەبتی کوڕی مالیکی کوڕی کەهلانی کوڕی سەبەئی کوڕی یەشجوبی کوڕی یەعرەبی کوڕی قەحتان، کە ئەزد هۆزێك بووە لە یەمەن.

سیجیستانیش: نیسبەتە بۆ سیجیستان، هەرێمێکە ئێستا دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای ئەفغانستان.

ئیمام ئەبو داود وەک خۆی باسی دەکات لە (٢٠٢هـ) لەدایک بووە لە سیجیستان.

وەک باسمان کرد ئەو عەرەبە و لە هۆزی ئەزدی یەمەنییە، یەکێک لە باپیرانی چووەتە ئەوێ لە کاتی فتوحاتی ئیسلامی، ئەوان جیهادیان کردووە لەپێناو خوا، پێشیان وا بووە دەبێت بکرێت بۆ بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام و ببێتە جیهانگیر و هەموو جیهان دابگرێت، بۆیە ئەو موسوڵمانە تێکۆشەرانەی کە شارێکیان فەتح دەکرد لەو شارە نیشتەجێ دەبوون کە فەتحیان دەکرد.

**هەوڵ و گەڕان و گەشتە زانستییەکانی:**

ئیمام ئەبو داود ﷺ لە جەوێک و سەردەمێکی پڕاوپڕ لە زانست گەشەی کردووە، بەتایبەت زانستی فەرمووده و ڕیوایەت کە لە قەڕنی سێیەمی هیجری لە هەموو کاتێک زیاتر گرینگیی پێ دراوە، کە لەو سەردەمە کۆمەڵە ئەستێرەیەکی گەشی زۆر لە حوففازی گەورە و مەزن هەبوون، لەو سەردەمە باو بووە کە فێرخوازان بۆ بەدەستهێنانی زانست دەگەڕان، کەم فێرخواز هەبوو ئیللا نیشتیمان و شوێنی لەدایکبوونی خۆی جێ دەهێشت، ئیمام ئەبو داود ﷺ لەو زانایانەیە کە گەشتی بۆ کۆکردنەوەی زانست هەڵبژاردووە بەسەر مانەوە لە وڵات و لانکەی خۆی، لەپاش ئەوەی بنچینەکانی زانستی لە تەمەنی لاویدا بەدەست هێنا، فەرموودەی هەر لە شارەکەی خۆی سیجیستان و ناوچەکانی دەوروپشتی کۆ کردەوە و نووسییەوە، بۆیە چاوی خستە سەر پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامیی ئەو کاتە کە شاری بەغداد بوو، لانکەی زانست و زانیاری بوو، لەگەڵ ئەوەی کە زۆر دوور و بە ماندووبوون بوو، بارگەی پێچایەوە چوو بۆ بەغداد لە هەڕەتی لاویەتی کە ئەو کاتە تەمەنی نەببووە هەژدە ساڵ، خۆی باسی دەکات کە ئەو کاتەی گەیشتە بەغداد ساڵی (٢٢٠هـ) بوو، لەو سەردەمە دیارترین ئیمام ئەو چەند ئیمامانە بوون:

١. ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (ت: ٢٤١هـ).

٢. ئیمام یەحیای کوڕی مەعین (ت: ٢٣٣هـ).

٣. ئیمام ئیبن ئەبو شەیبە (ت: ٢٣٥هـ).

٤. ئیمام ئیبن ڕاهەوەیهی (ت: ٢٣٨هـ).

٥. ئیمام ئەبو حاتیم (ت: ٢٥٠هـ).

٦. ئیمام ئەبو زوڕعە (ت: ٢٦٤هـ).

٧. ئیمام بوخاری (ت: ٢٥٦هـ).

٨. ئیمام زوهەیلی (ت: ٢٥٨هـ).

٩. ئیمام موسلیم (ت: ٢٦١هـ).

ڕەحمەتی خوای گەورە لە هەموویان، جگە لەوانەش کە نیشتنگەی دڵی فێرخواز و ڕازونیازی ئەوان بوون.

ئیمام ئەبو عەبدوڵڵا ئیمام حاکیم دەڵێت: ئەبو داود ئیمام و پێشەوای ئەهلی حەدیس بوو لە سەردەمی خۆی هاوشانی نەبوو: گوێگرتن و ئامادەیی هەبووە لە میسڕ و حیجاز و شام و زانایانی عێراق و خوڕاسان، فەرموودەی لە خوڕاسان نووسییەوە پێش ئەوەی بچێتە عێراق لە ناوچەی خۆی و لە هەراتی (ئەفغانستان)، لە بەغلانی (ئەفغانستان) لە قوتەیبەوە ڕیوایەتی کردووە کە بە ئیبن سەعید بەناوبانگ بوو، لە شاری ڕەی لە ئیبراهیمی کوڕی مووسای وەرگرتووە، لە نەیسابووریش وەریگرتووە.

**مامۆستاکانی:**



لە گرینگترین ئەو مامۆستایانەی کە پێیان گەیشتووە و زانستی لێ وەرگرتوون بەگشتی و زانستی فەرموودەی لێ وەرگرتوون بەتایبەتی ئەو دووانەن: ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ئیمام یەحیای کوڕی مەعین، جگە لەوانەش لە چەندین مامۆستای دیکە زانستی وەرگرتووە، گرنگترینیان ئەوانەن:

١. ئەحمەدی کوڕی حەنبەل.

٢. یەحیای کوڕی مەعین.

٣. ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەی.

٤. عوسمانی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبو شەیبە.

٥. موسلیمی کوڕی ئیبراهیمی ئەزدادی.

٦. زوهەیری کوڕی حەربی کوڕی شەدداد.

٧. موسلیمی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەزەدی ئەلفەڕاهیدی.

ڕەحمەتی خوای گەورە لە هەموویان.

## قوتابییەکانی:

ئیمام ئەبو داود ﷫ وەک زانایانی سەردەمی خۆی هەموو لایەکی زانست و زانیاری گرتووە لە لوغە و فیقهـ و فەرموودە و تەفسیر و جگە لەو زانستانە، بۆئەوەی ببێتە جێ و مەبەستی فێرخوازانی زانستی شەرعی، تا پەیتا پەیتا لە هەموو شوێنێک و ناوچەیەک و کون و کەلەبەرێکەوە بێنە خزمەتی تا زانستی لێ وەرگرن، بەتایبەت زانستی فەرموودە کە دەستێکی باڵای هەبوو تێیدا، هەبوو لە قوتابییەکانی هەموو پەرتووکی (السنن)ـی وەردەگرت بە ڕیوایەت، هەشبوو هەندێک لەو فەرموودانەی وەردەگرت کە ئەو ڕیوایەتی کردووە، ئەوانە هەندێکن لە دیارترین قوتابییەکانی:

١. ئیمام ئەبو عیسای تورموزی.
٢. ئیمام ئەبو عبدوڕڕەحمانی نەسائی.
٣. ئەبو بەکری نەججاد.
٤. ئەبو سەعیدی کوڕی ئەعرابی کە ڕاوی سونەنەکەیەتی.
٥. ئەبو بەکر ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی خەللال.
٦. ئیسماعیلی کوڕی موحەممەدی صەففار.
٧. ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی یاسینی هەڕەوی.

ڕەحمەتی خوای گەورەیان لێ بێت، وە زۆرێکی دیکە لە قوتابییەکانی کە جیهانیان پڕ لە زانست کرد.

## وتەی زانایان دەربارەی ئیمام ئەبو داود ﷫:

زۆر ئاساییە هەر کەسێک قوتابی ئەو پیاوە گەورەیە بێت لە ئەهلی عیلم بگاتە مەرتەبەیەکی بەرز و گەورە و مەزن، کە ببێتە مایەی ئەوەی بە پەنجە ئاماژەی بۆ بکرێت وە لە هەموو شوێنێک ستاییش و باسی بکرێت و ئاماژەی بۆ بکرێت، بۆ کەسێک کە تێیدایە و شایەنیەتی بەو زیرەکی و بیرتیژی و زاکیرە بەهێزە و زیهنە کارایە، لەگەڵ ئەو دڵسۆزییەی کە هەیەتی بۆ خوای گەورە، چونکە مرۆڤ هەرچەندە لە ڕووی زانستەوە بگاتە ئەو پلەیە ناکرێت و مەحاڵە خودای گەورە

ئاوا بەرەکەت بخاتە کارەکەی و سەرکەوتووی بکات، وە کارەکانی ئاوا قبووڵ وەربگرن و زانایان ستاییشی بکەن، ئیللا ئەوە بە دڵسۆزی دەکرێت کە ئەو کەسە تەنها بۆ خوای گەورە کارەکانی ئەنجام بدات، ئەوانەش هەموویان لە ئیمام ئەبو داوددا ﷺ ڕەنگی دابوویەوە، هەموو زانایانی سەردەمی خۆی دانیان پێدا نابوو، ئەو پێشەوا بوو لە هەموو زانستەکان بەتایبەت زانستی فەرموودە، بەوەی قۆڵی خۆی تەواو لێ هەڵماڵیبوو، بۆیە تەواو شارەزا ببوو لێی.

ئیمام ئەبو بەکری خەللال دەڵێت: ئەبو داود ئیمام و پێشەوای سەردەمی خۆی بوو، پیاوێک کە کەس پێشی نەکەوتۆتەوە لە تەخریجکردن لە زانستی حەدیس، وە کەس وەک ئەو لە سەردەمی خۆی ئاوا کون و کەلەبەرەکانی زانستی فەرموودەی نەدەزانی، پیاوێکی خواناس و جیا بوو لەگەڵ خەڵکی و سەرمەشقی خواناسان بوو، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموودەیەکی لەوەوە گوێ لێ بووە کە ئەبو داود خۆی باسی دەکات، وە ئیبراهیمی ئەصفەهانی و ئەبوبەکری کوڕی صەدەقە زۆر بەگەورەیان دادەنا و وا باسیان دەکرد کە کەس لەو سەردەمەی ئەو وا بەگەورە باسی نەکراوە.

ئیمام ئەحمەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی یاسینی هەرەوی دەڵێت: ئەبو داود یەکێک بووە لە حوففازە گەورەکانی ئیسلام بەوەی حافیزی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو و زانستیشی پێ هەبوو و عیللەتی فەرموودە و سەنەدیشی هەمووی لەبەر بووە، ئەو پیاوە لە بەرزترین پلە بووە لە زوهد و تەقوا و پاکی و ئەهلی چاکە و خواناسی، کە یەکێک بووە لە سوارچاکانی فەرموودە.

ئیمام و حافیز مووسای کوڕی هاڕوون دەڵێت: خودای گەورە ئەبو داودی لە دونیا دروست کردووە بۆ فەرموودە، وە لە دواڕۆژیش بۆ بەهەشت. دەشڵێت: کەسم نەبینیوە گەورەتر بێت لە ئەبو داود.

عەللانی کوڕی عەبدولصەمەد دەڵێت: گوێم لە دەرسەکانی ئەبو داود بووە ئەو یەکێک بووە لە سوارچاکانی ئەو کارە.

ئەبو حاتیم ئیبن حیببان دەڵێت: ئەبو داود یەکێک بووە لە پێشەواکانی دونیا هەم لە ڕووی فیقهەوە هەمیش لە ڕووی هەموو زانستەکانەوە، لە ڕووی حیفز و لە ڕووی زوهد و تەقواوە، لە ڕووی خواناسی و خواپەرستییەوە، فەرموودەی کۆ کردۆتەوە و پەرتووکی لەسەر داناوە، بەرگریی لە سونەنەکەی خۆی کردووە و پاراستوویەتی، ڕەددی ئەو کەسەی دەدایەوە کە موخالەفەی سونەنەکەی دەکرد و ڕەئی خۆی دەردەبڕی و بەرانبەری دەوەستایەوە.

ئیمام ئەبو عەبدوڵڵای کوڕی مەندە دەڵێت: ئەوانەی کە فەرموودەی صەحیحیان تەخریج کردووە، وە فەرموودە جێگیر و ڕاستەکانیان جیا کردۆتەوە لە فەرموودە مەعلوولەکان کە کێشەیان هەیە و ڕاستییان لە هەڵە جودا کردۆتەوە لە فەرموودە، ئەوانەن: موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری، ئەبو حوسەین، موسلیمی کوڕی حەججاجی قوشەیری، لەدوای ئەو سێیانە ئەبو داود سولەیمانی کوڕی ئەشعەسی کوڕی ئیسحاقی سیجیستانییە، وە ئەبو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی شوعەیبی نەسائی رحمهم الله.

ئیمام حاکیم ئەبو عەبدوڵڵا دەڵێت: ئەبو داود ئیمامی ئەهلی حەدیسە، ئەو هاوشانی نەبوو.

ئیمام نەوەوی دەڵێت: زانایان کۆدەنگن لەسەر ڕازیبوون و پیاهەڵدان بەسەر ئەبو داود، وە وەصفیان کردووە بە حیفزێکی تەواو، وە بە زانستی زۆر، وە بە کارجوانی لە کارەکەی و بە خواپەرستی و دینداری و فەهم و تێگەیشتنێکی قووڵ لە فەرموودە و هەموو زانستەکانی دیکە.

شێخی ئیسلام ئیمام ئیبن تەیمییە دەڵێت: ئەبو داود و بوخاری هەردووکیان ئیمام و پێشەوان لە فیقە و ئەهلی ئیجتیهادن.

ئیمام ئیبن عەبدولهادی دەڵێت: ئەبو داود ئیمام و بیرمەند و ژیرە، گەورەی حافیزەکانی فەرموودەیە.

ئیمام حافیزی زەهەبی دەڵێت: ئەبو داود پێشەوا و شێخی سوننەتە، وە پێشەوای هەموو حافیزەکانە. دەشڵێت: ئەبو داود لەگەڵ ئەوەی ئیمام و پێشەوا بووە لە فەرموودە و زانستەکانی فەرموودە، لەگەڵ ئەوەدا لە گەورەترینی شەرعزانان بووە، پەرتووکەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوە.

**وەفاتی ئیمام ئەبو داود ﷫:**

ئیمام ئەبو داود ﷫ پاش ئەوەی جیهانی ئیسلامی زیاتر ڕازاندەوە بە زانست و زانیاری و بە فەرموودەکانی خۆشەویست بۆنخۆشی کرد، لە بەصرە لە ڕۆژی هەینی، لە شازدەی شەووالی، ساڵی (٢٧٥هـ) لە تەمەنی حەفتا و سێ ساڵی وەفاتی کرد، لە تەنیشت گۆڕی سوفیانی سەوری نێژرا (ڕەزا و ڕەحمەتی خوای گەورە لە هەردووکیان بێت).

خوای گەورە بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوە بۆ ئەو خزمەتەی کە پێشکەشی ئیسلام و موسوڵمانانی کرد.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَصَلَّى اللهُ عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّد وَآلِهِ وَصَحْبِهِ وَمُحِبِّيهِ

# كِتَابُ الطَّهَارَةِ

## پەرتووکی پاکوخاوێنی

### بَابُ التَّخَلِّي عِنْدَ قَضَاءِ الْحَاجَةِ

### باسی دوورکەوتنەوە و خۆپەنادان لە کاتی سەرئاوکردندا

١. عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا ذَهَبَ الْمَذْهَبَ أَبْعَدَ.

موغیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك دەچووە سەرئاو، دوور دەکەوتەوە (بۆئەوەی دیار نەبێت).

تێبینی:

ئەمە پێش ئەو کاتە بوو کە شوێنی سەرئاوکردن دروست بکرێت، بەڵام دوای ئەوەی شوێنی تایبەت بە سەرئاوکردن دروست کرا، کارەکە لە شوێنی خۆی ئەنجام دەدرا.

٢. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَرَادَ الْبَرَازَ انْطَلَقَ، حَتَّى لَا يَرَاهُ أَحَدٌ.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: کاتێك پێغەمبەر ﷺ ویستبای سەرئاو بکات، دەڕۆیشت (هەتا لەپێش چاوی خەڵك دوور دەکەوتەوە)، بۆئەوەی هیچ کەس نەیبینێت.

## بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ

## باسی ئەو (دوعایەی) مرۆڤ دەیڵێت لە کاتی چوونە سەرئاو

٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ الْخَلَاءَ يَقُولُ: «أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الْخُبُثِ وَالْخَبَائِثِ».

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دەچووە سەرئاو دەیفەرموو: «پەنا دەگرم بە خوا (لە خراپە و زیانی) شەیتانە نێرینە و مێیینەکان».



تێبینی:

وەك زانایان فەرموویانە: چونکە شوێنی سەرئاوکردن، جێگای کۆبوونەوە و مانەوەی جن و شەیتانەکان و دەرخستنی عەورەتی مرۆڤە.

(الْخُبُث): کۆیە، واتە: شەیتانە نێرینەکان.

(الْخَبَائِث): کۆیە، واتە: شەیتانە مێیینەکان.

## بَابٌ فِي الرَّجُلِ يَذْكُرُ اللَّهَ تَعَالَى عَلَى غَيْرِ طُهْرٍ

## باسێك دەربارەی کەسێك کە بەبێدەستنوێژی یادی خوا بکات

٤. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَذْكُرُ اللَّهَ ﷻ عَلَى كُلِّ أَحْيَانِهِ.

عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو حاڵەت و کاتەکانی یادی خوای دەکرد ﷻ. (کەواتە دەستنوێژت هەبێت یاخود نەتبێت زیکرکردن ئاساییە و دروستە، بەڵام باشتر وایە دەستنوێژت هەبێت).

## بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا خَرَجَ مِنَ الخَلَاءِ

### باسی ئەو (زیکرەی) مرۆڤ دەیڵێت لە کاتی دەرچوون لە سەرئاو

٥. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنَ الغَائِطِ قَالَ: «غُفْرَانَكَ».

عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك دەهاتەدەر لە سەرئاو دەیفەرموو: «خوایە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم».

## بَابُ السِّوَاكِ

### باسی سیواك

٦. عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي، لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ».

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «ئەگەر قورس نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم، فەرمانم پێ دەکردن بە سیواککردن لە کاتی هەموو نوێژێك».

## بَابُ فَرْضِ الْوُضُوءِ

### باسی پێویستییەتی (فەڕزییەتی) دەستنوێژ

٧. عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَقْبَلُ اللَّهُ ﷻ صَدَقَةً مِنْ غُلُولٍ، وَلَا صَلَاةً بِغَيْرِ طُهُورٍ».

ئەبو مەلیح لە باوکیەوە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: خوا ﷻ صەدەقەیەك وەرناگرێت لە ماڵی دزیاری بێت، نوێژێکیش وەرناگرێت کە بەبێ دەستنوێژ بێت.

تێبینی:

(غُلُول): دزیکردنە لە غەنیمەت و دەستکەوتی جەنگ.



٨. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ، وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ».

عەلی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دەسپێکی نوێژ دەستنوێژە، قەدەغەکراوەکانی بە گوتنی (الله أکبر) دەست پێ دەکات، بەهۆی سەلامدانەوە قەدەغەکراوەکان ڕێگەیان پێ دەدرێتەوە».

## بَابُ الْمَاءِ لَا يُجْنِبُ

### باسی ئەوەی کە ئاو پیس نابێت

٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: اغْتَسَلَ بَعْضُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ فِي جَفْنَةٍ، فَجَاءَ النَّبِيُّ ﷺ

لِيَتَوَضَّأَ مِنْهَا أَوْ يَغْتَسِلَ، فَقَالَتْ: لَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي كُنْتُ جُنُبًا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْمَاءَ لَا يُجْنِبُ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: یەكێك لە خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ بە ئاوی جامێكی گەورە خۆی شوشت، جا پێغەمبەریش ﷺ هات و ویستی دەستنوێژ بە ئاوی ئەو جامە بشوات، یان خۆی پێ بشوات، (هاوسەرەكەی) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لەشگران بووم، (ئایا ئەوە پیس نەبووە)؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بێگومان ئاوەكە پیس نابێت».

تێبینی:

هاوسەرەكەی پێغەمبەری خوا ﷺ كە مەیموونە پووری ئیبن عەبباسە ﵄ نەچۆتە نێو جام، یان تەشتەكە خۆی بشوات، بەڵكوو بە دەستی ئاوی لەنێو تەشتەكە دەرهێناوە بۆ خۆشوشتن.

## بَابُ الْوُضُوءِ بِسُؤْرِ الْكَلْبِ

### باسی دەستنوێژ شوشتن بە ئاوی پاشماوەی سەگ

١٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «طُهُورُ إِنَاءِ أَحَدِكُمْ إِذَا وَلَغَ فِيهِ الْكَلْبُ، أَنْ يُغْسَلَ سَبْعَ مِرَارٍ، أُولَاهُنَّ بِتُرَابٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «پاكبوونەوەی قاپەكانتان ئەگەر سەگ دەمی تێ وەردابێت، بەوە دەبێت حەوت جار بشۆردرێت و جاری یەكەمیشیان بە قوڕ بێت».

١١. عَنِ ابْنِ مُغَفَّلٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَ بِقَتْلِ الْكِلَابِ، ثُمَّ قَالَ: «مَا لَهُمْ

وَلَهَا»، فَرَخَّصَ فِي كَلْبِ الصَّيْدِ، وَفِي كَلْبِ الْغَنَمِ وَقَالَ: «إِذَا وَلَغَ الْكَلْبُ فِي الْإِنَاءِ فَاغْسِلُوهُ سَبْعَ مِرَارٍ، وَالثَّامِنَةُ عَفِّرُوهُ بِالتُّرَابِ».

ئیبن موغەففەل ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتا فەرمانی کرد بە کوشتنی سەگەکان، پاشان فەرمووی: «ئێوە چ کارتان پێیان هەیە»، پاشان ڕێگەی دا بە ڕاگرتنی سەگی ڕاو و سەگی لای مەڕ (لە ڕیوایەتێکی دیکەش ڕێگەی بە سەگی باخداری داوە)، فەرمووی: «ئەگەر سەگ دەمی خستە دەفرێکەوە، حەوت جار بیشۆن و جاری هەشتەمیش دەفرەکە بە قوڕاو بشۆن».

## بَابُ سُؤْرِ الْهِرَّةِ

## باسی پاشماوەی پشیلە

١٢. عَنْ كَبْشَةَ بِنْتِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ - وَكَانَتْ تَحْتَ ابْنِ أَبِي قَتَادَةَ -: أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ دَخَلَ فَسَكَبْتُ لَهُ وَضُوءًا، فَجَاءَتْ هِرَّةٌ فَشَرِبَتْ مِنْهُ، فَأَصْغَى لَهَا الْإِنَاءَ حَتَّى شَرِبَتْ، قَالَتْ كَبْشَةُ: فَرَآنِي أَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَقَالَ: أَتَعْجَبِينَ يَا ابْنَةَ أَخِي؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، إِنَّهَا مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ».

کەبشەی کچی کەعبی کوڕی مالیك -کە هاوسەری کوڕێکی ئەبو قەتادەیە-، دەگێڕێتەوە: ئەبو قەتادە هاتە ژوورەوە، منیش ئاوم بۆی دەڕژاندە دەفرێکەوە بۆ دەستنوێژ، پاشان پشیلەیەك هات و لە ئاوی دەفرەکەی خواردەوە، ئەویش دەفرەکەی بۆ لار کردەوە تا (پشیلەکە) ئاوی خواردەوە، کەبشە گوتی: پاشان بینیی سەیرم دەکرد، گوتی: ئەی برازای خۆم پێت سەیرە؟ منیش گوتم: بەڵێ، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پشیلە پیس نییە، بەڵکوو پشیلە لەو گیاندارانەیە لەنێو ماڵەکانتان دێن و دەڕۆن و دەسووڕێنەوە».

تێبینی:

(الطَّوَّافِين): واته وەکوو مرۆڤەکان و خزمەتکارەکانتان وان کە بە دەوری یەکدیدا دەسووڕێنەوە و لەنیو یەکدیدا دەژین.

(الطَّوَّافَات): واته ئەو ئاژەڵانەی لەگەڵ مرۆڤ دەژین و تێکەڵیان بوونە وەکوو مەڕ و مانگا و بزن و وشتر، پشیلەش وەکوو مرۆڤەکان و ئاژەڵەکان وایە، چۆن ئێوە خۆتان بەردەوام بەدەوری یەکدیدا دەسووڕێنەوە و دێن و دەڕۆن و تێکەڵ دەبن لەگەڵ یەکدی، بەهەمان شێوە پشیلەش ئاوایە.

١٣. عَنْ دَاوُدَ بْنِ صَالِحِ بْنِ دِينَارٍ التَّمَّارِ، عَنْ أُمِّهِ: أَنَّ مَوْلَاتَهَا أَرْسَلَتْهَا بِهَرِيسَةٍ إِلَى عَائِشَةَ ﵂، فَوَجَدَتْهَا تُصَلِّي، فَأَشَارَتْ إِلَيَّ أَنْ ضَعِيهَا، فَجَاءَتْ هِرَّةٌ، فَأَكَلَتْ مِنْهَا، فَلَمَّا انْصَرَفَتْ أَكَلَتْ مِنْ حَيْثُ أَكَلَتِ الْهِرَّةُ، فَقَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ إِنَّمَا هِيَ مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ»، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ بِفَضْلِهَا.

داودی کوڕی صالیحی کوڕی دیناری تەمار لە دایکیەوە دەگێڕێتەوە: گەورەکەی (خواردنی) هەریسەی پێدا ناردووە بۆ دایکمان عائیشە ﵂، بینیی وا نوێژ (ی سوننەت) دەکات، پاشان ئاماژەی بۆ کردم داینێم، پاشان پشیلەیەك هات و لێی خوارد، کاتێك پشیلەکە ڕۆیشت ئەویش لە هەمان شوێنی پشیلەکەوە لێی خوارد و فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پشیلە پیس نییە، وەکوو مرۆڤەکان بەدەورتان دەسووڕێنەوە و دێن و دەچن لەگەڵتان»، بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ لە پاشماوەی ئاوی پشیلە دەستنوێژی گرتووە.

## بَابُ الْوُضُوءِ بِمَاءِ الْبَحْرِ

## باسی دەستنوێژ شوشتن بە ئاوی دەریا

١٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ يَقُولُ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا نَرْكَبُ الْبَحْرَ، وَنَحْمِلُ مَعَنَا الْقَلِيلَ مِنَ الْمَاءِ، فَإِنْ تَوَضَّأْنَا بِهِ عَطِشْنَا، أَفَنَتَوَضَّأُ بِمَاءِ الْبَحْرِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ الْحِلُّ مَيْتَتُهُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە (سواری کەشتی دەبین) دەچینە نێو دەریا، کەمێك ئاو لەگەڵ خۆماندا هەڵدەگرین، ئەگەر دەستنوێژی پێ بشۆین تینوومان دەبێت، ئایا بە ئاوی دەریا دەستنوێژ بشۆین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئاوی دەریا پاکە، مرداروەبووی نێویشی حەڵاڵە».

## بَابُ أَيُصَلِّي الرَّجُلُ وَهُوَ حَاقِنٌ؟

## باسێك دەربارەی ئەوەی ئایا پیاو دەتوانێت لە تەنگاویدا نوێژ بكات؟

١٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْأَرْقَمِ ﵁: أَنَّهُ خَرَجَ حَاجًّا، أَوْ مُعْتَمِرًا وَمَعَهُ النَّاسُ، وَهُوَ يَؤُمُّهُمْ، فَلَمَّا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ أَقَامَ الصَّلَاةَ، صَلَاةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ قَالَ: لِيَتَقَدَّمْ أَحَدُكُمْ وَذَهَبَ إِلَى الْخَلَاءِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، يَقُولُ: «إِذَا أَرَادَ أَحَدُكُمْ أَنْ يَذْهَبَ الْخَلَاءَ وَقَامَتِ الصَّلَاةُ، فَلْيَبْدَأْ بِالْخَلَاءِ».

عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەم ﵁ دەگێڕێتەوە: کە دەرچووە بۆ حەج یان عومرە و خەڵکیشی لەگەڵ بوو، پێشەوایان بوو، جا ڕۆژێکیان لە کاتێکدا کە قامەت کرا بۆ نوێژی بەیانی، پاشان گوتی: با کەسێکتان بێتە پێشەوە و پێشنوێژی بکات، خۆی

چوو بۆ سەرئاو، فەرمووی: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «ئەگەر یەکێکتان ویستی بچێتە سەرئاو و قامەتی نوێژ کرا، با بچێتە سەرئاو».

تێبینی:

هۆکارەکەی ئەوەیە: دەستنوێژەکەی نوێ دەکاتەوە، چونکە نوێژخوێن لەو حاڵەتەدا دڵی لای نوێژەکە نابێت.

## بَابُ الْإِسْرَافِ فِي الْمَاءِ

### باسی زیادەڕۆییکردن لە (بەکارهێنانی) ئاودا

١٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ؓ: سَمِعَ ابْنَهُ يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ الْقَصْرَ الْأَبْيَضَ، عَنْ يَمِينِ الْجَنَّةِ إِذَا دَخَلْتُهَا، فَقَالَ: أَيْ بُنَيَّ، سَلِ اللَّهَ الْجَنَّةَ، وَتَعَوَّذْ بِهِ مِنَ النَّارِ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّهُ سَيَكُونُ فِي هَذِهِ الْأُمَّةِ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الطَّهُورِ وَالدُّعَاءِ».

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ؓ دەگێڕێتەوە: گوێی لە کوڕەکەی بووە (لە کاتی دوعا) دەیگوت: خوایە داوای کۆشکە سپییەکەی لای ڕاستی بەهەشتت لێ دەکەم ئەگەر چوومە نێو بەهەشت، ئەویش پێی گوت: کوڕم داوای چوونە بەهەشت لە خوا بکە و پەنای پێ بگرە لە چوونە دۆزەخ، چونکە گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «لە داهاتوودا لەنێو ئوممەتەکەم کەسانێك زێدەڕۆیی دەکەن لە دەستنوێژ شوشتن و پاڕانەوەدا».

## بَابٌ فِي إِسْبَاغِ الْوُضُوءِ

### باسێك دەربارەی جوان دەستنوێژ شوشتن

١٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى قَوْمًا وَأَعْقَابُهُمْ تَلُوحُ، فَقَالَ: «وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ، أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کەسانێکی بینی لە کاتی دەستنوێژ پاژنەی پێیان بریقەی دەهات و وشك دیار بوو، ئەویش فەرمووی: «سزای سەخت بۆ ئەو پاژنەپێیانە، دەستنوێژ بەجوانی بشۆن».

## بَابٌ فِي الرَّجُلِ يُدْخِلُ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ قَبْلَ أَنْ يَغْسِلَهَا

### باسێك دەربارەی ئەوەی کەسێك پێش دەستشوشتن دەست بخاتە نێو دەفری ئاوەکە



١٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ، فَلَا يُدْخِلْ يَدَهُ فِي الْإِنَاءِ حَتَّى يَغْسِلَهَا ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لَا يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ، أَوْ أَيْنَ كَانَتْ تَطُوفُ يَدُهُ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «ئەگەر لە شەودا یەکێکتان لە خەو هەستا با دەستی نەخاتە نێو دەفرێکەوە هەتا سێ جار دەستی دەشوات، چونکە نازانێت دەستی لەکوێ بووە و بەر چ شتێك کەوتووە».

## بَابُ صِفَةِ وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ

## باسی چۆنیەتی دەستنوێژی پێغەمبەر ﷺ

١٩. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى قَالَ: رَأَيْتُ عَلِيًّا رضي الله عنه تَوَضَّأَ فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثًا، وَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ ثَلَاثًا، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَاحِدَةً، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا تَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ.

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا دەڵێت: بینیم عەلی رضي الله عنه دەستنوێژی شوشت، جا سێ جار ڕوخساری شووشت، هەردوو باسکی سێ جار شووشت (بە ئانیشکیەوە)، یەك جار مەسحی سەری کرد، پاشان گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوەیە دەستنوێژی دەشوشت.

## بَابُ تَخْلِيلِ اللِّحْيَةِ

## باسی دەست خستنە نێو ڕیش (لە کاتی دەستنوێژ)

٢٠. عَنْ أَنَسِ ابْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا تَوَضَّأَ، أَخَذَ كَفًّا مِنْ مَاءٍ فَأَدْخَلَهُ تَحْتَ حَنَكِهِ فَخَلَّلَ بِهِ لِحْيَتَهُ، وَقَالَ: «هَكَذَا أَمَرَنِي رَبِّي عز وجل».

ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دەستنوێژی دەشوشت، مشتێك ئاوی هەڵدەگرت دەیخستە ژێر چەناگەیەوە، دەستی دەخستە نێو ڕیشی بۆئەوەی تەڕ ببێت، وە دەیفەرموو: «بەم شێوازە پەروەردگارم عز وجل فەرمانی پێ کردووم».

## بَابُ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ

### باسی مەسحکردن لەسەر خوففەکان

٢١. عَنِ الْمُغِيرَةَ ﵁ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَكْبِهِ وَمَعِي إِدَاوَةٌ فَخَرَجَ لِحَاجَتِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ فَتَلَقَّيْتُهُ بِالْإِدَاوَةِ فَأَفْرَغْتُ عَلَيْهِ فَغَسَلَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ، ثُمَّ أَرَادَ أَنْ يُخْرِجَ ذِرَاعَيْهِ، وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ مِنْ صُوفٍ مِنْ جِبَابِ الرُّومِ، ضَيِّقَةُ الْكُمَّيْنِ، فَضَاقَتْ فَادَّرَعَهُمَا ادِّرَاعًا، ثُمَّ أَهْوَيْتُ إِلَى الْخُفَّيْنِ لِأَنْزَعَهُمَا، فَقَالَ لِي: «دَعِ الْخُفَّيْنِ، فَإِنِّي أَدْخَلْتُ الْقَدَمَيْنِ الْخُفَّيْنِ وَهُمَا طَاهِرَتَانِ فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا».

موغیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین (لە گەشتێکدا)، قاپێکم پێ بوو ئاوی تێدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ سەرئاو، دوایی هاتەوە، منیش بە ئاوەوە چووم بەرەو ڕووی، ئاوم بە دەستیدا کرد، دەستی و ڕوخساری شوشت، پاشان ویستی قۆڵەکانی بێنێتەدەر، جوببەیەکی صوفی لەبەر بوو بە جوببەی ڕۆمەکان دەچوو، قۆڵەکانی تەسك بوو دەستی بۆ دەرنەدەهێنرا، لەژێر جوببەکەوە دەستی دەرهێنا باسکی شوشت، پاشان داهاتمەوە بۆئەوەی خوففەکانی لەپێ دابکەنم، پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: «واز بهێنە لە خوففەکان، کە لەپێم کردوون، (پێیەکانم) پاك بوون (واتە: دەستنوێژم هەبوو)، بۆیە تەنها مەسحی کردن».

## بَابُ التَّوْقِيتِ فِي الْمَسْحِ

### باسی کاتدانان بۆ مەسحکردن

٢٢. عَنْ خُزَيْمَةَ بْنِ ثَابِتٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمَسْحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ لِلْمُسَافِرِ ثَلَاثَةُ أَيَّامٍ، وَلِلْمُقِيمِ يَوْمٌ وَلَيْلَةٌ».

خوزەیمەی کوڕی سابیت ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «(ماوەی) مەسحکردن بەسەر خوففەکانەوە بۆ گەشتیار سێ ڕۆژە، هەروەها بۆ کەسی نیشتەجێ ڕۆژ و شەوێکە».

## بَابُ كَيْفَ الْمَسْحُ

### باسی چۆنیەتی مەسحکردن

٢٣. عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ.

موغیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ مەسحی لەسەر خوففەکانی دەکرد.

٢٤. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: لَوْ كَانَ الدِّينُ بِالرَّأْيِ لَكَانَ أَسْفَلُ الْخُفِّ أَوْلَى بِالْمَسْحِ مِنْ أَعْلَاهُ، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُ عَلَى ظَاهِرِ خُفَّيْهِ.

عەلی ﵁ دەڵێت: ئەگەر ئایین بە بیروبۆچوون و ئەقڵ بووایە، دەبووایە ژێر خوففەکان مەسح بکرایە نەك سەری (لەبەر ئەوەی ژێر خوفف پیس دەبێت)، بەڵام بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ مەسحی لەسەر خوففەکە کردووە.

تێبینی:

فەرموودەی پێشەوا عەلی ﵁ ئەوەی لێ ناخوێندرێتەوە کە ئەقڵ هیچ دەوری نییە، بەڵکوو بە پێچەوانەوە، بەبێ ئەقڵ لە ئایین تێناگەین، بەڵام ئەو مەبەستی ئەوەیە کە ئەقڵ بەبێ ڕێنمایی نەقڵ (شەریعەت) ناتوانێت سەر لە ئەحکامەکان دەربکات، بەتایبەت لە عیبادەتەکاندا، ئەگەرنا لە کاروباری دونیادا دەستمان کراوەیە بۆ بەکارهێنانی ئەقڵ، نەك هەر ئەوە، بەڵکوو لە زۆر شوێنی قورئان و فەرموودەدا

فەرمانمان پێ کراوە کە ئەقڵ بەکار بێنین و لەسەرمان پێویستە.

## بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا تَوَضَّأَ

## باسی ئەو زیکرەی کە مرۆڤ لەدوای دەستنوێژ دەیڵێت (لە زیکرەکان)

٢٥. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ خُدَّامَ أَنْفُسِنَا، نَتَنَاوَبُ الرِّعَايَةَ - رِعَايَةَ إِبِلِنَا - فَكَانَتْ عَلَيَّ رِعَايَةُ الْإِبِلِ، فَرَوَّحْتُهَا بِالْعَشِيِّ، فَأَدْرَكْتُ رَسُولَ اللَّهِ يَخْطُبُ النَّاسَ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُومُ فَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ، يُقْبِلُ عَلَيْهِمَا بِقَلْبِهِ وَوَجْهِهِ، إِلَّا قَدْ أَوْجَبَ»، فَقُلْتُ: بَخٍ بَخٍ، مَا أَجْوَدَ هَذِهِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ الَّتِي قَبْلَهَا: يَا عُقْبَةُ، أَجْوَدُ مِنْهَا، فَنَظَرْتُ فَإِذَا هُوَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ، فَقُلْتُ: مَا هِيَ يَا أَبَا حَفْصٍ؟ قَالَ: إِنَّهُ قَالَ آنِفًا قَبْلَ أَنْ تَجِيءَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ يَتَوَضَّأُ فَيُحْسِنُ الْوُضُوءَ، ثُمَّ يَقُولُ حِينَ يَفْرُغُ مِنْ وُضُوئِهِ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، إِلَّا فُتِحَتْ لَهُ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ الثَّمَانِيَةُ، يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا».

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ دەڵێت: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین خزمەتی خۆمان دەکرد، بەنۆرە لەلای حوشترەکان دەبووین و چاودێریمان دەکردن، کە نۆرەی من بوو لەلای حوشترەکان بم (چاودێرییان بکەم، بیانلەوەڕێنم) بە شەو حوشترەکانم هێنایەوە بۆ مۆڵگەکەیان، بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتم و فریای کەوتم، وتاری بۆ خەڵك دەدا گوێم لێ بوو دەیفەرموو: «هیچ یەکێك لە ئێوە نییە بەجوانترین شێوە دەستنوێژ بشوات، پاشان هەڵسێت دوو ڕکات نوێژ بکات، بە دڵ و بە ڕووحی ئاگای لە نوێژەکەی بێت، مسۆگەر بەهەشتی بۆ پێویست دەبێت، گوتم: بەخ بەخ، ئەمە چەند شتێکی چاك و باشە، پیاوێك لەپێشم بوو، گوتی: ئەی عوقبە ئەوەی پێش ئەمە کە پێغەمبەر ﷺ باسی

کرد له ئەمە چاکتریش بوو، کاتێك سەیر دەکەم عومەری کوڕی خەتتابە ﵁، گوتم: ئەی باوکی حەفص (ئەم شتە) چییە؟ گوتی: پێش ئەوەی تۆ بێیت بۆ ئێرە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «هیچ یەکێك نییە لە ئێوە کە بەجوانترین دەستنوێژ بشوات، پاشان دوای ئەوەی لە دەستنوێژەکە تەواو بوو بڵێت: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە شایەنی پەرستن بێ جگە لە خوا، خوا تاك و تەنهایە و بێهاوتایە، شایەتیش دەدەم کە موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە، مسۆگەر هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لە هەر کامیانەوە ویستی لێ بێت لەوێوە دەچێتە ژوورەوە».

## بَابُ الرَّجُلِ يُصَلِّ الصَّلَوَاتِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ

### باسی کەسێك هەر پێنج نوێژەکە بە یەك دەستنوێژەوە بکات



٢٦. عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الْفَتْحِ خَمْسَ صَلَوَاتٍ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ، وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: إِنِّي رَأَيْتُكَ صَنَعْتَ الْيَوْمَ شَيْئًا لَمْ تَكُنْ تَصْنَعُهُ، قَالَ: «عَمْدًا صَنَعْتُه».

سولەیمانی کوڕی بورەیدە لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەتحی مەککەدا پێنج نوێژی فەڕزی بە یەك دەستنوێژ کرد، مەسحی لەسەر خوففەکانیشی کرد، عومەر ﵁ پێی گوت: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەمڕۆ شتێکم بینی ئەنجامت دا پێشتر وات نەدەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «(ئەی عومەر) بەئەنقەست وام کرد (تاکوو ببێتە یاسا و شەرع)».

## بَابٌ إِذَا شَكَّ فِي الْحَدَثِ

### باسێك دەربارەی ئەوە ئەگەر كەسێك گومانی هەبوو لە دەستنوێژشكانی

٢٧. عَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ، عَنْ عَمِّهِ ﵁ قَالَ: شُكِيَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ الرَّجُلُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلَاةِ حَتَّى يُخَيَّلَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: «لَا يَنْفَتِلْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا، أَوْ يَجِدَ رِيحًا».

عەببادی كوڕی تەمیم، لە مامیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: سكاڵا كرا لەلای پێغەمبەر ﷺ ئەگەر پیاوێك لەنێو نوێژدا هەست بە شتێك بكات (جا دەنگ، یان بۆن)، هەتا وای لێ دێت گومان دەبات دەستنوێژی شكاوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «با واز لە نوێژەكەی نەهێنێت، هەتا گوێی لە دەنگێك دەبێت، یان بۆنێك دەكات».

٢٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلَاةِ فَوَجَدَ حَرَكَةً فِي دُبُرِهِ، أَحْدَثَ أَوْ لَمْ يُحْدِثْ، فَأَشْكَلَ عَلَيْهِ فَلَا يَنْصَرِفْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا، أَوْ يَجِدَ رِيحًا».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەكێك لە ئێوە لەنێو نوێژدا هەستی بە جووڵەیەك كرد لە دواوەی، (هاتە دڵی) ئایا دەستنوێژی شكاوە یان نەشكاوە، كێشەی بۆ دروست بوو، با نوێژەكەی بەجێ نەهێڵێت هەتا بەدڵنیایی گوێی لە دەنگێك دەبێت، یان بۆنێك دەكات».

## بَابٌ فِي الْوُضُوءِ مِنَ النَّوْمِ

### باسێك دەربارەی دەستنوێژ شوشتنەوە بەهۆی خەوتن

٢٩. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَنْتَظِرُونَ الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ حَتَّى

تَخْفِقَ رُءُوسُهُمْ، ثُمَّ يُصَلُّونَ وَلَا يَتَوَضَّئُونَ.

ئەنەس ﵁ دەڵێت: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ چاوەڕێی نوێژی عیشای کۆتاییان دەکرد، (لەبەر ئەوەی بە نوێژی مەغریبیش هەر دەگوترا: عیشا)، تا خەو دەیبردنەوە و سەریان بەملاولادا دەهات، پاشانیش نوێژیان دەکرد و دەستنوێژیان نەدەشوشتەوە.

تێبینی:

کەواتە: ئەگەر کەسێك دەستنوێژی هەبوو و بەدانیشتنەوە خەو بردیەوە، ئەوە لەبەر ئەوەی بەچەسپاوی و جێگیری دانیشتووە، دەستنوێژی ناشکێنێت).

## بَابٌ فِي الْمَذْيِ

## باسێك دەربارەی مەزی

٣٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَعْدٍ الْأَنْصَارِيِّ ﵁ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَمَّا يُوجِبُ الْغُسْلَ، وَعَنِ الْمَاءِ يَكُونَ بَعْدَ الْمَاءِ، فَقَالَ: «ذَاكَ الْمَذْيُ، وَكُلُّ فَحْلٍ يَمْذِي، فَتَغْسِلُ مِنْ ذَلِكَ فَرْجَكَ وَأُنْثَيَيْكَ، وَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ».

عەبدوڵڵای کوڕی سەعدی ئەنصاری ﵁ دەڵێت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد لەو شتانەی خۆشوشتن پێویست دەکەن، هەروەها لە ئاو لەدوای ئاو (مەزی لەدوای مەزی، کە دێت خۆشوشتن پێویست دەکات)؟ فەرمووی: «ئەو ئاوەی کە تۆ باسی دەکەی مەزییە، هەموو نێرێك مەزی هەیە، دامێنت بەتەواوی بشۆ، دەستنوێژ بشۆوە وەکوو چۆن دەستنوێژ بۆ نوێژ دەشۆیت (واتە: دەستنوێژ دەشکێنێت، بەڵام خۆشوشتن پێویست ناکات)».

## بَابُ الْوُضُوءِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يَعُودَ

### باسی دەستنوێژ شوشتنەوە بۆ کەسێك کە دەیەوێت دووبارە سەرجێیی بکات

٣١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَتَى أَحَدُكُمْ أَهْلَهُ، ثُمَّ بَدَا لَهُ أَنْ يُعَاوِدَ، فَلْيَتَوَضَّأْ بَيْنَهُمَا وُضُوءًا».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێك لە ئێوە چووە لای خێزانی (سەرجێیی لەگەڵدا کرد)، پاشان هەستی کرد دەیەوێت دووبارە سەرجێیی لەگەڵ بکاتەوە، با لەو نێوانەدا دەستنوێژێك بشوات».

## بَابٌ فِي الْجُنُبِ يَنَامُ

### باسێك دەربارەی خەوتنی کەسی لەشگران

٣٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: ذَكَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّهُ تُصِيبُهُ الْجَنَابَةُ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَوَضَّأْ وَاغْسِلْ ذَكَرَكَ، ثُمَّ نَمْ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب پرسیاری (بۆ عەبدوڵڵای کوڕی) کردووە کە لە شەودا تووشی لەشگرانی دەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: «(پێی بڵێ) دامێنت بشۆ و دەستنوێژیش بگرە، ئینجا بخەوە».

## بَابُ فِي الْجُنُبِ يُصَافِحُ

### باسێك دەربارەی تەوقەكردنی كەسی لەشگران

٣٣. عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَقِيَهُ فَأَهْوَى إِلَيْهِ، فَقَالَ: إِنِّي جُنُبٌ، فَقَالَ: «إِنَّ الْمُسْلِمَ لَا يَنْجُسُ».

حوزەیفە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پێی گەیشت، (پێغەمبەری خوا ﷺ) دەستی بۆ درێژ كرد بۆئەوەی تەوقە بكات، گوتی: من لەشگرانم، فەرمووی: «بێگومان مرۆڤی موسوڵمان پیس نابێت».

## بَابُ فِي الْجُنُبِ يُصَلِّ بِالْقَوْمِ وَهُوَ نَاسٍ

### باسێك دەربارەی ئیمام كە لەشگران بێت و پێشنوێژیی بۆ خەڵك بكات و لەبیری نەبێت

٣٤. عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ، فَأَوْمَأَ بِيَدِهِ أَنْ مَكَانَكُمْ، ثُمَّ جَاءَ وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ فَصَلَّى بِهِمْ.

ئەبو بەكرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە نێو نوێژی بەیانییەوە، بە دەستی ئاماژەی كرد لە شوێنی خۆتان بمێننەوە، (ڕۆیشت) پاشان هاتەوە ئاو بەسەریدا دەچۆڕایەوە (چووە ماڵ خۆی شوشت و هاتەوە)، ئینجا پێشنوێژیی بۆ كردن.

## بَابٌ فِي الرَّجُلِ يَجِدُ الْبِلَّةَ فِي مَنَامِهِ

### باسێك دەربارەی ئەو کەسەی لە خەودا تەڕی ببینێت

٣٥. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يَجِدُ الْبَلَلَ وَلَا يَذْكُرُ احْتِلَامًا، قَالَ: «يَغْتَسِلُ»، وَعَنِ الرَّجُلِ يَرَى أَنَّهُ قَدْ احْتَلَمَ وَلَا يَجِدُ الْبَلَلَ، قَالَ: «لَا غُسْلَ عَلَيْهِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێك لە خەویدا خەبەری دەبێتەوە تەڕییەك دەبینێت، هیچ لەبیریشی نییە کە خەوی بینیبێت، فەرمووی: «خۆی دەشوات (واتە: دەبێت خۆی بشوات)»، دەربارەی پیاوێکیش خەبەری دەبێتەوە دەزانێت خەوی بینیوە (لەگەڵ ئافرەت جوت بووە)، بەڵام خەبەری دەبێتەوە تەڕی (مەنی) نابینێت، فەرمووی: «خۆشوشتنی لەسەر نییە».

## بَابٌ فِي الْغُسْلِ مِنَ الْجَنَابَةِ

### باسێك دەربارەی خۆشوشتن بەهۆی لەشگرانی

٣٦. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ دَعَا بِشَيْءٍ مِنْ نَحْوِ الْحِلَابِ، فَأَخَذَ بِكَفَّيْهِ فَبَدَأَ بِشِقِّ رَأْسِهِ الْأَيْمَنِ، ثُمَّ الْأَيْسَرِ، ثُمَّ أَخَذَ بِكَفَّيْهِ، فَقَالَ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بەهۆی لەشگرانییەوە خۆی شوشتبا داوای هەندێك (ئاو)ی دەکرد بەئەندازەی حیلابێك، ئینجا بە هەردوو لوێچی دەستی ئاوی هەڵدەگرت و سەرەتا بە بەشی لای ڕاستی سەری دەستی پێ دەکرد، پاشان لای چەپ، پاشان بە هەردوو لوێچی ئاوی هەڵدەگرت و بەسەر سەریدا دەکرد.

تێبینی:

(الْحِلَاب): جۆرە دەفرێك بووە شیریان تێ کردووە.

## بَابُ فِي الْمَرْأَةِ هَلْ تَنْقُضُ شَعْرَهَا عِنْدَ الْغُسْلِ

### باسێك دەربارەی ئەوەی کە ئافرەت قژی بەستبوو، بۆ خۆشوشتن دەیکاتەوە

٣٧. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَتْ إِحْدَانَا إِذَا أَصَابَتْهَا جَنَابَةٌ أَخَذَتْ ثَلَاثَ حَفَنَاتٍ - هَكَذَا تَعْنِي بِكَفَّيْهَا جَمِيعًا - فَتَصُبُّ عَلَى رَأْسِهَا، وَأَخَذَتْ بِيَدٍ وَاحِدَةٍ فَصَبَّتْهَا عَلَى هَذَا الشِّقِّ، وَالْأُخْرَى عَلَى الشِّقِّ الْآخَرِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: یەکێك لە ئێمە (خێزانانی پێغەمبەر ﷺ) ئەگەر تووشی لەشگرانی بووایە، سێ مشت ئاوی هەڵدەگرت -بەم شێوازە بە هەردوو دەستی- ئاوی دەکرد بە سەریدا، ئینجا مشتێك ئاوی بە لای ڕاستیدا دەکرد، مشتێکی دیکەشی بە لای چەپیدا دەکرد.

## بَابُ فِي مُؤَاكَلَةِ الْحَائِضِ وَمُجَامَعَتِهَا

### باسێك دەربارەی خواردن و تێکەڵاوی لەگەڵ ئافرەتی حەیزدار

٣٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَضَعُ رَأْسَهُ فِي حِجْرِي فَيَقْرَأُ وَأَنَا حَائِضٌ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەری دەکردە کۆشم و قورئانی دەخوێند، لە کاتێکدا من حەیزدار بووم.

تێبینی:

ڕوونە کە قوڕئانەکەی لەبەر خوێندووە، ئەگەر مرۆڤ موصحەفی پێ بێت، جوان نییە بەڕاکشانەوە لەسەر موصحەفەکە بخوێنێت، بەڵام ئەگەر قوڕئانەکەی لەبەر بوو دیارە کێشەی نییە.

## بَابٌ فِي إِتْيَانِ الْحَائِضِ

### باسێك دەربارەی چوونە لای ئافرەتی حەیزدار (بۆ سەرجێیی)

٣٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭫ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فِي الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ، قَالَ: «يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ أَوْ نِصْفِ دِينَارٍ».

ئیبن عەبباس ﭫ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: (پرسیاری لێ کرا) دەربارەی پیاوێك کە بچێتە لای خێزانی لە حەیزدا و سەرجێیی لەگەڵدا بکات، فەرمووی: «دینارێك یان نیو دینار کەفارەتی دەکەوێتە سەر (دەبێت بیدات)».

٤٠. عَنْ عِكْرِمَةَ عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَرَادَ مِنَ الْحَائِضِ شَيْئًا أَلْقَى عَلَى فَرْجِهَا ثَوْبًا.

عیکریمە دەگێڕێتەوە لە هەندێك لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ (گوتوویانە): پێغەمبەر ﷺ ئەگەر شتێکی لە هاوسەرەکانی بویستایە کە لە حەیزدا بوون (وەك نزیکبوونەوە)، پارچەیەك قوماشی بەسەر دامێنیدا دەدا (بۆئەوەی کە لاشەیان بە ڕووتی بەریەك نەکەوێت).

## بَابُ مَنْ رَوَى أَنَّ: الْحَيْضَةَ إِذَا أَدْبَرَتْ لَا تَدَعُ الصَّلَاةَ

### باسی ئەوانەی ڕیوایەتی ئەوەیان کردووە: ئەگەر حەیز تەواو بوو ئافرەت واز لە نوێژ ناهێنێت

٤١. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ أَبِي حُبَيْشٍ ﵂، جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فَلَا أَطْهُرُ أَفَأَدَعُ الصَّلَاةَ؟ قَالَ: «إِنَّمَا ذَلِكَ عِرْقٌ، وَلَيْسَتْ بِالْحَيْضَةِ، فَإِذَا أَقْبَلَتِ الْحَيْضَةُ فَدَعِي الصَّلَاةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ، ثُمَّ صَلِّي».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: فاتیمەی کچی ئەبو حوبەیش ﵂ هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: من ئافرەتێکم تووشی خوێنچرکە دەبم، (پاك نابمەوە بەردەوام خوێنم هەیە) ئایا واز لە نوێژ بهێنم؟ فەرمووی: «ئەمە دەمارە و حەیز نییە، کاتێك حەیزەکەت هات واز لە نوێژ بهێنە، کە حەیزت تەواو بوو، ئەوە خۆت بشۆ، خۆت لە خوێنەکە پاك بکەوە و نوێژ بکە (ئەوە بۆ ئەو ئافرەتانەیە کە کات و ماوەی عادەبوونیان دەزانن)».

## بَابُ التَّيَمُّمِ

### باسی تەیەممومکردن

٤٢. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى قَالَ: كُنْتُ عِنْدَ عُمَرَ ﵁، فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّا نَكُونُ بِالْمَكَانِ الشَّهْرَ وَالشَّهْرَيْنِ فَقَالَ عُمَرُ: أَمَّا أَنَا فَلَمْ أَكُنْ أُصَلِّي حَتَّى أَجِدَ الْمَاءَ. قَالَ: فَقَالَ عَمَّارٌ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ أَمَا تَذْكُرُ إِذْ كُنْتُ أَنَا وَأَنْتَ فِي الْإِبِلِ، فَأَصَابَتْنَا جَنَابَةٌ، فَأَمَّا أَنَا، فَتَمَعَّكْتُ، فَأَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ أَنْ تَقُولَ هَكَذَا، وَضَرَبَ بِيَدَيْهِ إِلَى الْأَرْضِ، ثُمَّ نَفَخَهُمَا، ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ

وَيَدَيْهِ إِلَى نِصْفِ الذِّرَاعِ». فَقَالَ عُمَرُ: يَا عَمَّارُ اتَّقِ اللَّهَ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، إِنْ شِئْتَ وَاللَّهِ لَمْ أَذْكُرْهُ أَبَدًا، فَقَالَ عُمَرُ: كَلَّا وَاللَّهِ لَنُوَلِّيَنَّكَ مِنْ ذَلِكَ مَا تَوَلَّيْتَ.

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبزا دەڵێت: لەلای عومەر ﵁ بووم، لەو کاتەدا پیاوێك هات و گوتی: جاری وایە ئێمە لە شوێنێك مانگێك، یان دوو مانگ دەمێنینەوە (ئاویشمان دەست ناکەوێت بۆ نوێژ)، عومەر گوتی: بەڵام من نوێژ ناکەم هەتاکوو ئاو پەیدا دەکەم، ئیدی عەممار گوتی: ئەی پێشەوای بڕواداران لەبیرت نییە ئەو جارەی کە من و تۆ لای وشترەکان بووین و تووشی لەشگرانی هاتین، جا من خۆم لە خۆڵ وەردا (و نوێژەکەم کرد)، ئینجا هاتینەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەو باسەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: «لە ڕاستیدا هەر ئەوەندە بەس بوو بیکەیت، هەردوو دەستی لە (ڕووی) زەوی دا و پاشان فووی لێ کردن (تاکوو ڕوخسار زۆر بەتۆز نەبێت)، پاشان بە دەستەکانی ڕوخساری مەسح کرد و دەستەکانی هەتا نیوەی باسکی مەسح کرد»، ئینجا عومەر گوتی: ئەی عەممار لە خوا بترسە (من ئەوەم لەبیر نییە لەخۆوە شت نەڵێیت)، ئەویش گوتی: ئەی فەرمانڕەوای بڕواداران سوێند بە خوا ئەگەر پێتخۆشە هەرگیز (ئەو بابەتە) باس ناکەمەوە، عومەریش گوتی: نا، نەخێر، بە خوا بابەتەکە بەتەمای تۆ لێ دەگەڕێین وەکوو تۆ دەڵێیت.



## بَابٌ فِي الْغُسْلِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ

## باسێك دەربارەی خۆشوشتن لە ڕۆژی هەینیدا

٤٣. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «غُسْلُ يَوْمِ الْجُمُعَةِ وَاجِبٌ عَلَى كُلِّ مُحْتَلِمٍ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خۆشوشتنی

ڕۆژی هەینی پێویستە لەسەر هەموو کەسێکی باڵغ (پیاو)».

٤٤. عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ الثَّقَفِيُّ ﵁: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ غَسَّلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاغْتَسَلَ، ثُمَّ بَكَّرَ وَابْتَكَرَ، وَمَشَى وَلَمْ يَرْكَبْ، وَدَنَا مِنَ الْإِمَامِ فَاسْتَمَعَ وَلَمْ يَلْغُ كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ عَمَلُ سَنَةٍ أَجْرُ صِيَامِهَا وَقِيَامِهَا».

ئەوسی کوڕی ئەوسی سەقەفی ﵁ (دەڵێت): گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «هەر کەسێك ڕۆژی هەینی خۆی بشوات و زوو بێت و فریای وتاری هەینی بکەوێت، بەپیادە بڕوات سوار (ی هیچ سوارییەك) نەبێت (ئەگەر ماڵی نزیك بێت)، لە وتارخوێن نزیك ببێتەوە، قسە نەکات (خۆی سەرقاڵ نەکات)، بە هەر هەنگاوێك پاداشتی یەك ساڵی دەست دەکەوێت کە بە ڕۆژ بەڕۆژوو بێت، بە شەو شەونوێژ بکات».



## بَابُ بَوْلِ الصَّبِيِّ يُصِيبُ الثَّوْبَ

## باسی ئەوەی کە میزی منداڵ بەر پۆشاك بکەوێت

٤٥. عَنْ لُبَابَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ قَالَتْ: كَانَ الْحُسَيْنُ بْنُ عَلِيٍّ ﵄ فِي حِجْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَبَالَ عَلَيْهِ فَقُلْتُ: الْبَسْ ثَوْبًا وَأَعْطِنِي إِزَارَكَ حَتَّى أَغْسِلَهُ. قَالَ: «إِنَّمَا يُغْسَلُ مِنْ بَوْلِ الْأُنْثَى وَيُنْضَحُ مِنْ بَوْلِ الذَّكَرِ».

لوبابەی کچی حاریس دەڵێت: حوسەینی کوڕی عەلی ﵄ لە باوەشی پێغەمبەری خوادا ﷺ بوو میزی کرد، پێم گوت: پۆشاکێکی دیکە لەبەر بکە، پۆشاکەکەتم بدەرێ هەتا بۆت بشۆم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەگەر کچ بێت میز بە پۆشاکدا بکات دەشۆردرێت، ئەگەر کوڕ بێت تەنها ئاوی پێدا دەپرژێنرێت (ئەگەر منداڵە کوڕەکە تەنها شیری دایکی بخوات و شتی دیکە نەخوات)».

## بَابُ الْأَرْضِ يُصِيبُهَا الْبَوْلُ

### باسی زەوییەك كە میزی لەسەر دەكرێت

٤٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ أَعْرَابِيًّا دَخَلَ الْمَسْجِدَ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسٌ فَصَلَّى قَالَ ابْنُ عَبْدَةَ: رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: اللَّهُمَّ ارْحَمْنِي وَمُحَمَّدًا، وَلَا تَرْحَمْ مَعَنَا أَحَدًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَقَدْ تَحَجَّرْتَ وَاسِعًا». ثُمَّ لَمْ يَلْبَثْ أَنْ بَالَ فِي نَاحِيَةِ الْمَسْجِدِ فَأَسْرَعَ النَّاسُ إِلَيْهِ، فَنَهَاهُمُ النَّبِيُّ ﷺ وَقَالَ: «إِنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ، وَلَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ، صُبُّوا عَلَيْهِ سَجْلًا مِنْ مَاءٍ». أَوْ قَالَ: «ذَنُوبًا مِنْ مَاءٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێكی دەشتەكی هاتە مزگەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، كابرا نوێژی كرد، ئیبن عەبدە دەڵێت: دوو ڕكات نوێژی كرد، پاشان گوتی: خوایە بەزەیی بنوێنە بە من و بە موحەممەد، بەزەیی مەنوێنە لەگەڵ ئێمە بە هیچ كەسێك، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «بەڕاستی شتێكی زۆر و فراوانت بەرتەسك كردەوە»، پاشان زۆری پێ نەچوو، لەلایەكی مزگەوتەكە میزی كرد، خەڵكی بەپەلە بەرەو ڕووی چوون (بۆ ئەوەی میز نەكات لەنێو مزگەوت)، پێغەمبەر ﷺ ڕێگریی لێ كردن، وە فەرمووی: «بێگومان ئێوە نێردراون ئاسانكار بن، نەنێردراون قورسكار بن، دۆلكەیەكی پڕ لە ئاوی بەسەردا بكەن (بەوە پاك دەبێتەوە)».

تێبینی:

(سَجْلًا): دۆلكەیەكی پڕ ئاو، ئەگەر دۆلكەكە پڕ نەبێت پێی ناڵێن: السجل.

(ذَنُوبًا): ئەویش واتە دۆلكەی پڕ.

## بَابٌ فِي طُهُورِ الْأَرْضِ إِذَا يَبِسَتْ

### باسێك دەربارەی پاكبوونەوەی زەوی كاتێك وشك دەبێتەوە

٤٧. قَالَ ابْنُ عُمَرَ ﵄: كُنْتُ أَبِيتُ فِي الْمَسْجِدِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَكُنْتُ فَتًى شَابًّا عَزَبًا، وَكَانَتِ الْكِلَابُ تَبُولُ وَتُقْبِلُ وَتُدْبِرُ فِي الْمَسْجِدِ، فَلَمْ يَكُونُوا يَرُشُّونَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ گەنج بووم سەڵت بووم، شەو لە مزگەوت دەمامەوە، جا سەگەل لەنێو مزگەوت دەهاتن و دەچوون و میزیشیان دەكرد، ئیدی هیچ شوێن و شتێكیان لەبەر ئەو كارە نەدەشوشتەوە (ئاویان بە شوێنەكەیدا نەدەكرد).

## بَابٌ فِي الْأَذَى يُصِيبُ النَّعْلَ

### باسی پیسییەك بەر نەعل بكەوێت (نەعل و پێڵاو)

٤٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا وَطِئَ أَحَدُكُمْ بِنَعْلِهِ الْأَذَى، فَإِنَّ التُّرَابَ لَهُ طَهُورٌ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر پیسی بەر نەعل (پێڵاو)ی یەكێك لە ئێوە كەوت، ئەوا خۆڵەكە بۆی پاككەرەوەیە. (واتە: ئەگەر بەر شوێنێكی پیس بكەوێت و دواتر نەعل و پێڵاوەكە بەر شوێنێكی پاكی زەوی بكەوێت، ئەوا پێڵاو و نەعلەكە پاك دەبێتەوە)».

# كِتَابُ الصَّلَاةِ

# پەرتووکی نوێژ

## بَابُ فَرْضِ الصَّلَاةِ

## باسی فەرزبوونی نوێژ



٤٩. عن طَلْحَةَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ ﵁ يَقُولُ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَهْلِ نَجْدٍ ثَائِرَ الرَّأْسِ يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ وَلَا يُفْقَهُ مَا يَقُولُ: حَتَّى دَنَا، فَإِذَا هُوَ يَسْأَلُ عَنِ الْإِسْلَامِ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ»، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُنَّ؟ قَالَ: «لَا، إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ»، قَالَ: وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صِيَامَ شَهْرِ رَمَضَانَ»، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ: «لَا إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ»، قَالَ: وَذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الصَّدَقَةَ، قَالَ: فَهَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: «لَا إِلَّا أَنْ تَطَوَّعَ»، فَأَدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللَّهِ لَا أَزِيدُ عَلَى هَذَا وَلَا أَنْقُصُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ».

تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا ﵁ دەڵێت: پیاوێك خەڵکی نەجد بوو هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ قژی ئاڵۆز بوو (شانەی نەکردبوو، قژئاڵۆز بوو)، گیزەگیزێکی وەکوو گیزەی مێشەنگی لێ دەبیسترا، بەڵام لە قسەکەی تێنەدەگەیشتی تا نزیك

عَبْدِي هَذَا يُؤَذِّنُ، وَيُقِيمُ الصَّلَاةَ، يَخَافُ مِنِّي، قَدْ غَفَرْتُ لِعَبْدِي وَأَدْخَلْتُهُ الْجَنَّةَ».

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «پەروەردگارتان تەعەجوبی دێت بە شوانی مەڕێك کە لەسەر تەپۆلکەی شاخێك بانگ بدات و نوێژ بکات، خوا ﷻ بە فریشتەکان دەفەرموێت: تەماشای بەندەکەی من بکەن، بانگ دەدات و قامەت دەکات بۆ نوێژ، لە من دەترسێت، ئەوە منیش لەو بەندەیەی خۆم خۆش بووم و خستمە بەهەشتەوە».

تێبینی:

(شَظِيَّة): واتە: پارچەیەك لە شاخەکە، یان تاوێرێکیان هاتبێتە دەرەوە وەکوو لووتی شاخەکە بچێتە سەر ئەوە.

## بَابُ الْجَمْعِ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ

### باسی کۆکردنەوەی دوو نوێژەکان

١٨٧. عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ عَامِرِ بْنِ وَاثِلَةَ: أَنَّ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ ﵁ أَخْبَرَهُمْ، أَنَّهُمْ خَرَجُوا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْمَعُ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، فَأَخَّرَ الصَّلَاةَ يَوْمًا، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ جَمِيعًا، ثُمَّ دَخَلَ، ثُمَّ خَرَجَ، فَصَلَّى الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ جَمِيعًا.

ئەبو توفەیل عامیری کوڕی واسیلە دەڵێت: موعازی کوڕی جەبەل ﵁ پێی ڕاگەیاندوون، لە غەزای تەبووکدا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کۆ کردەوە، مەغریب و عیشای پێکەوە کۆ کردەوە، ڕۆژێك نوێژەکەی دوا خست، پاشان هاتە دەرەوە نوێژی نیوەڕۆ و عەسری کرد

بەیەکەوە، پاشان چووەوە ژوورەوە (خێمەیەکی بۆ هەڵدرابوو)، پاشان هاتە دەرەوە لەم شوێنە، نوێژی مەغریب و عیشای پێکەوە کرد.

١٨٨. عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ ﵄ اسْتُصْرِخَ عَلَى صَفِيَّةَ وَهُوَ بِمَكَّةَ، فَسَارَ حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَبَدَتِ النُّجُومُ، فَقَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ، كَانَ إِذَا عَجِلَ بِهِ أَمْرٌ فِي سَفَرٍ، جَمَعَ بَيْنَ هَاتَيْنِ الصَّلَاتَيْنِ، فَسَارَ حَتَّى غَابَ الشَّفَقُ، فَنَزَلَ فَجَمَعَ بَيْنَهُمَا.

نافیع دەگێڕێتەوە: ئیبن عومەر ﵄ داوای فریاکەوتنی لێکرا و هاوارێکی بۆ کرا لەبەر ئەوەی صەفییە کۆچی دوایی کردبوو، (ئیبن عومەر لە مەککە بوو هەواڵیان هێنا بۆ مەککە)، ئەمیش هات کەوتە ڕێ تا خۆر ئاوا بوو ئەستێرە دەرکەوت، گوتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر پەلەی بووایە لە سەفەردا ئەم دوو نوێژەی کۆ دەکردەوە، تێپەڕی تا سوورایییەکە دیار نەما و ئاوا بوو، دابەزی (نوێژی شێوان و خەوتنانی) پێکەوە کۆ کردنەوە.

١٨٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ، وَالْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِالْمَدِينَةِ مِنْ غَيْرِ خَوْفٍ، وَلَا مَطَرٍ، فَقِيلَ لِابْنِ عَبَّاسٍ: مَا أَرَادَ إِلَى ذَلِكَ؟ قَالَ: أَرَادَ أَنْ لَا يُحْرِجَ أُمَّتَهُ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەدینەدا ڕۆژێك نوێژی نیوەڕۆ و عەسر، وە نوێژی مەغریب و عیشاشی کۆ کردنەوە بێ ئەوەی ترسیان لەسەر بێت، وە بێ ئەوەی باران بێت، بە ئیبن عەبباس گوترا: بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی لەو کارە چی بوو؟ گوتی: مەبەستی ئەوە بووە کە ئوممەتەکەی تووشی بارقورسی نەبن.

## بَابُ قَصْرِ قِرَاءَةِ الصَّلَاةِ فِي السَّفَرِ

### باسی قورئانخوێندنی کورت لە نوێژی گەشتدا

١٩٠. عَنِ الْبَرَاءِ ﵁ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَصَلَّى بِنَا الْعِشَاءَ الْآخِرَةَ، فَقَرَأَ فِي إِحْدَى الرَّكْعَتَيْنِ، بِالتِّينِ وَالزَّيْتُونِ.

بەڕاء ﵁ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ سەفەرێك دەرچووین، نوێژی عیشای بۆ کردین (کە عادەتەن نوێژی عیشای درێژ دەکردەوە) لە یەکێك لە ڕکاتەکان سووڕەتی (والتين والزيتون)ی خوێند (واتە: درێژی نەکردەوە).

## بَابُ التَّطَوُّعِ عَلَى الرَّاحِلَةِ وَالْوِتْرِ

### باسی ئەنجامدانی نوێژی سوننەت و نوێژی ویتر بەسواری وڵاخ

١٩١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُسَبِّحُ عَلَى الرَّاحِلَةِ أَيَّ وَجْهٍ تَوَجَّهَ، وَيُوتِرُ عَلَيْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ لَا يُصَلِّي الْمَكْتُوبَةَ عَلَيْهَا.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی سوننەتی بەسواری وڵاخەکەیەوە دەکرد ڕووی لەهەر لایەك بووایە، ویتریشی لەسەر دەکرد، بەڵام نوێژی فەڕزی لەسەر نەدەکرد.

## بَابُ الْفَرِيضَةِ عَلَى الرَّاحِلَةِ مِنْ عُذْرٍ

### باسی نوێژ کردن بکات بەسواری بەهۆی پاساوەوە

١٩٢. عَنْ عَطَاءِ بْنِ أَبِي رَبَاحٍ: أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ ﵂، هَلْ رُخِّصَ لِلنِّسَاءِ أَنْ يُصَلِّينَ

عَلَى الدَّوَابِّ؟ قَالَتْ: لَمْ يُرَخَّصْ لَهُنَّ فِي ذَلِكَ، فِي شِدَّةٍ وَلَا رَخَاءٍ. قَالَ مُحَمَّدٌ: هَذَا فِي الْمَكْتُوبَةِ.

عەتائی کوڕی ئەبو ڕەباح، پرسیاری کرد لە عائیشە ﵂، ئایا مۆڵەت دراوە ئافرەتان بەسواری نوێژ بکەن؟ گوتی: مۆڵەتیان پێ نەدراوە بەم شتە نە لە کاتی سەغڵەتی و نە لە کاتی خۆشیدا، (واتە: بەبێ زەڕورەت). موحەممەد دەڵێت: ئەمەی کە مۆڵەت نییە مەبەست پێی نوێژی فەڕزە.

## بَابُ مَتَى يُتِمُّ الْمُسَافِرُ؟

### باسی ئەوە کە لە چ کاتێك گەشتیار نوێژ بەتەواوی دەکات

١٩٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَقَامَ سَبْعَ عَشْرَةَ بِمَكَّةَ يَقْصُرُ الصَّلَاةَ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَمَنْ أَقَامَ سَبْعَ عَشْرَةَ قَصَرَ، وَمَنْ أَقَامَ أَكْثَرَ أَتَمَّ، قَالَ أَبُو دَاوُدَ: قَالَ عَبَّادُ بْنُ مَنْصُورٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: أَقَامَ تِسْعَ عَشْرَةَ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ حەڤدە ڕۆژ لە مەککە مایەوە نوێژی کورت دەکردەوە، هەر ئیبن عەبباس دەڵێت: هەر کەسێك حەڤدە ڕۆژ لە شوێنێك مایەوە نوێژ کورت دەکاتەوە، ئەگەر زیاتر بوو نوێژەکەی تەواو دەکات. ئەبو داود دەڵێت: عەبادی کوڕی مەنسووڕ لە عیکریمەوە گێڕاویەتەوە، ئەویش لە ئیبن عەبباسەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نۆزدە ڕۆژ ماوەتەوە، (ئەم نۆزدە ڕۆژە لە هەموو ڕیوایەتەکان پەسندترە).

١٩٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: فَرَضَ اللَّهُ تَعَالَى الصَّلَاةَ عَلَى لِسَانِ نَبِيِّكُمْ ﷺ فِي الْحَضَرِ أَرْبَعًا، وَفِي السَّفَرِ رَكْعَتَيْنِ، وَفِي الْخَوْفِ رَكْعَةً.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: خوای گەورە نوێژی فەرز کردووە لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتانەوە ﷺ لە شاری خۆتدا چوار (ڕکات)، لە گەشت دوو ڕکات، لە ترسیشدا یەك ڕکات.

## بَابُ تَفْرِيعِ أَبْوَابِ التَّطَوُّعِ وَرَكَعَاتِ السُّنَّةِ

### باسی ئەوەی پەیوەستە بە نوێژی سوننەت و ئەو ڕکاتانەی کە سوننەتن

١٩٥. عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ صَلَّى فِي يَوْمٍ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً تَطَوُّعًا، بُنِيَ لَهُ بِهِنَّ بَيْتٌ فِي الْجَنَّةِ».

ئومم حەبیبە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك لە ڕۆژێکدا دوانزە ڕکات نوێژی سوننەت بکات، ئەوە بەهۆی ئەوانەوە کۆشکێکی بۆ لە بەهەشت دروست دەکرێت».



## بَابُ رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ

### باسی دوو ڕکات (سوننەتی پێش نوێژی) بەیانی

١٩٦. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَكُنْ عَلَى شَيْءٍ مِنَ النَّوَافِلِ أَشَدَّ مُعَاهَدَةً مِنْهُ عَلَى الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الصُّبْحِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هیچ نوێژێکی سوننەتدا بەئەندازەی دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی پابەند و سوور نەبووە لەسەریان.

## بَابٌ فِي تَخْفِيفِهِمَا

## باسی پوخت و ئاسانكردنی دوو ڕكات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی

١٩٧. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُخَفِّفُ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلَاةِ الْفَجْرِ، حَتَّى إِنِّي لَأَقُولُ: هَلْ قَرَأَ فِيهِمَا بِأُمِّ الْقُرْآنِ؟!

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە جۆرێك دوو ڕكاتەكەی پێش نوێژی بەیانی كورت و پوخت دەكرد، دەمگوت: دەبێت (سووڕەتی) فاتیحەی تێدا خوێندبن؟!

١٩٨. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ وَالنَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي الصُّبْحَ، فَصَلَّى الرَّكْعَتَيْنِ، ثُمَّ دَخَلَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الصَّلَاةِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، قَالَ: «يَا فُلَانُ، أَيَّتُهُمَا صَلَاتُكَ؟ الَّتِي صَلَّيْتَ وَحْدَكَ، أَوِ الَّتِي صَلَّيْتَ مَعَنَا؟».

عەبدوڵڵای كوڕی سەڕجیس ﵁ دەڵێت: پیاوێك هات پێغەمبەر ﷺ نوێژی بەیانی دەكرد (فەڕزەكەی دابەستوو) ئەو دوو ڕكات سوننەتی كرد، پاشان فریاكەوت هاتە نێو نوێژەكە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ كە نوێژەكەی تەواو كرد فەرمووی: «ئەی فڵانە كەس كامەیان نوێژە فەڕزەكەت بوو، ئەو دوو ڕكاتەی بەجیا كردت، یان ئەو دوو ڕكاتەی لەگەڵ ئێمەدا كردت».

تێبینی:

پێغەمبەر ﷺ وەكوو تەمبێكردن ئەوەی پێ فەرمووە، واتە: جارێكی دیكە وا مەكە، قامەت كرا سوننەت مەكە، ئەگەر بشزانیت فریای جەماعەتەكە دەكەویت هەر ئەنجامی مەدە.

١٩٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ، فَلَا صَلَاةَ إِلَّا الْمَكْتُوبَةَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کات قامەت کرا (بۆ نوێژی فەرز)، ئەوە هیچ نوێژێك ناکرێت جگە لە نوێژە فەرزەکە».

## بَابُ مَنْ فَاتَتْهُ مَتَى يَقْضِيهَا

## باسی ئەو کەسەی نوێژی چووە کەی دەیگێڕێتەوە

٢٠٠. أَنْ قَيْسِ بْنِ عَمْرٍو ﵁ قَالَ: رَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَجُلًا يُصَلِّي بَعْدَ رَكْعَتَيْنِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاةُ الصُّبْحِ رَكْعَتَانِ»، فَقَالَ الرَّجُلُ: إِنِّي لَمْ أَكُنْ صَلَّيْتُ الرَّكْعَتَيْنِ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، فَصَلَّيْتُهُمَا الْآنَ، فَسَكَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ.

قەیسی کوڕی عەمر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی لەدوای نوێژی بەیانی (نوێژە فەرزەکە) دوو ڕکاتی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «نوێژی بەیانی هەر دوو ڕکاتە!»، پیاوەکە گوتی: من ئەو دوو ڕکاتە سوننەتەی پێش نوێژی بەیانیم نەکردبوو، ئێستا کردمەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو.

تێبینی:

پێغەمبەری خوا ﷺ بە کردارەکەی ڕازی بووە، بۆیە دەنگی نەکردووە، ئەوە لە زانستی ئوسوڵی فیقیهدا پێی دەڵێن: سوننەتی تەقریری.

## بَابُ الْأَرْبَعِ قَبْلَ الظُّهْرِ وَبَعْدَهَا

## باسی چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆ و چوار ڕکات دوای نوێژی نیوەڕۆ

٢٠١. قَالَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ ﵂ زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَافَظَ عَلَى

أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ قَبْلَ الظُّهْرِ، وَأَرْبَعٍ بَعْدَهَا، حَرُمَ عَلَى النَّارِ».

ئوم حەبیبەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك پارێزگاری لە چوار ڕکات نوێژی سوننەت بکات لەپێش نوێژی نیوەڕۆ، چوار ڕکاتیش لەپاش نوێژی نیوەڕۆ، ئەوە (سوتاندنی) لەسەر ئاگری دۆزەخ حەرام دەبێت.

٢٠٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: شَهِدَ عِنْدِي رِجَالٌ مَرْضِيُّونَ فِيهِمْ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ - وَأَرْضَاهُمْ عِنْدِي عُمَرُ - أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا صَلَاةَ بَعْدَ صَلَاةِ الصُّبْحِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَلَا صَلَاةَ بَعْدَ صَلَاةِ الْعَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: کۆمەڵێك پیاو لەلام بوون کە جێگەی ڕەزامەندی (ی خوا و خەڵك) بوون، عومەریشیان لەنێودا بوو، -لە هەمووشیان زیاتر لەلای من عومەر جێگەی ڕەزامەندی بوو-، گوتیان: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لەدوای نوێژی بەیانی هەتاکوو خۆر هەڵدێت هیچ نوێژێکی دیکە بوونی نییە، هەروەها لەدوای نوێژی عەسریش هەتاکوو خۆر تەواو ئاوا دەبێت هیچ نوێژێکی دیکە بوونی نییە».

## بَابُ الصَّلَاةِ قَبْلَ الْمَغْرِبِ

## باسی نوێژی (سوننەتی) پێش نوێژی شێوان

٢٠٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلُّوا قَبْلَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ»، ثُمَّ قَالَ: «صَلُّوا قَبْلَ الْمَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ لِمَنْ شَاءَ»، خَشْيَةَ أَنْ يَتَّخِذَهَا النَّاسُ سُنَّةً.

عەبدوڵڵای موزەنی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پێش نوێژی شێوان

دوو ڕکات بکەن»، پاشان فەرمووی: «دوو ڕکات نوێژ بکەن پێش نوێژی شێوان کێ ویستی لێ بوو»، لەوە ترساوە نەوەکوو خەڵکی بیکەنە سوننەتێکی بەردەوام.

٢٠٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ، بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ لِمَنْ شَاءَ».

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا نوێژ هەیە، لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێکدا نوێژ هەیە بۆ کەسێك کە بیەوێت. (زانایان ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە بۆ سوننەتی پێش نوێژی جومعە)».

## بَابُ صَلَاةِ الضُّحَى

## باسی نوێژی چێشتەنگاو

٢٠٥. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُصْبِحُ عَلَى كُلِّ سُلَامَى مِنَ ابْنِ آدَمَ صَدَقَةٌ، تَسْلِيمُهُ عَلَى مَنْ لَقِيَ صَدَقَةٌ، وَأَمْرُهُ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ، وَنَهْيُهُ عَنِ الْمُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَإِمَاطَتُهُ الْأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ صَدَقَةٌ، وَبُضْعَةُ أَهْلِهِ صَدَقَةٌ، وَيُجْزِئُ مِنْ ذَلِكَ كُلِّهِ رَكْعَتَانِ مِنَ الضُّحَى».

ئەبو زەڕ ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەموو ئادەمیزادێك بەیانی کە ڕۆژ دەکاتەوە پێویستە لەسەری خێر بکات لەجیاتی هەموو جومگەیەك لە جومگەکانی، سڵاوکردنی لە کەسێك ئەوە خێرە، فەرمانکردنی بە چاکە خێرە، ڕێگریکردنی لە خراپە خێرە، لابردنی ئازارێك لەسەر ڕێی خەڵکی خێرە، سەرجێییکردنی لەگەڵ خێزانیدا خێرە، ئەوەی جێی هەموویت بۆ پڕ دەکاتەوە دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاوە».

٢٠٦. عَنْ نُعَيْمِ بْنِ هَمَّارٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «يَقُولُ اللَّهُ ﷻ: يَا ابْنَ آدَمَ، لَا تُعْجِزْنِي مِنْ أَرْبَعِ رَكَعَاتٍ فِي أَوَّلِ نَهَارِكَ، أَكْفِكَ آخِرَهُ».

نوعەیمی کوڕی هەممار ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا ﷻ دەفەرموێت: «ئەی وەچەی ئادەم، دەستەپاچە مەبە لەوەی لە سەرەتای ڕۆژدا چوار ڕکات نوێژ بۆ من بکەی، منیش دەستەبەری کۆتایی ڕۆژەکەت بۆ دەکەم».

## بَابُ فِي صَلَاةِ النَّهَارِ

### باسێك دەربارەی نوێژی ڕۆژ

٢٠٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلَاةُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ مَثْنَى مَثْنَى».

ئیبن عومەر ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «نوێژی (سوننەتی) شەو و ڕۆژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە (بە شەو یان بە ڕۆژ کەسێك نوێژی سوننەت بکات، ئەوە با دوو ڕکات دوو ڕکات ئەنجامیان بدات)».

## بَابُ قِيَامِ اللَّيْلِ

### باسی هەستانەوە بۆ شەونوێژ

٢٠٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يَعْقِدُ الشَّيْطَانُ عَلَى قَافِيَةِ رَأْسِ أَحَدِكُمْ، إِذَا هُوَ نَامَ ثَلَاثَ عُقَدٍ، يَضْرِبُ مَكَانَ كُلِّ عُقْدَةٍ عَلَيْكَ لَيْلٌ طَوِيلٌ، فَارْقُدْ، فَإِنِ اسْتَيْقَظَ فَذَكَرَ اللَّهَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ تَوَضَّأَ انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَإِنْ صَلَّى انْحَلَّتْ عُقْدَةٌ، فَأَصْبَحَ نَشِيطًا، طَيِّبَ النَّفْسِ، وَإِلَّا أَصْبَحَ خَبِيثَ النَّفْسِ كَسْلَانَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێك یەکێکتان خەوتووە شەیتان سێ گرێ لە پشتەسەری دەدات، لەگەڵ هەر گرێیەك کە دەیدات لە سەرت، دەڵێت: شەوێکی درێژ، جا پاڵکەوە (خەوێکی قووڵ)، جا هەر کاتێك (ئەو کەسە) هەستا و یادی خوای کرد ئەوە گرێیەك دەکرێتەوە، ئەگەر دەستنوێژیشی شوشت ئەوە گرێیەك دەبێتەوە، خۆ ئەگەر نوێژیشی کرد ئەوە گرێیەك دەبێتەوە (هەرسێ گرێیەکە دەکرێنەوە)، بۆیە (ئەو کەسە) بەچوست و چالاکی بەیانی دەکاتەوە و دەروونی ئارامە، خۆ ئەگەر وا نەبوو ئەوە بەتەمبەڵی و دەروون پیسی و شڵەژاوی بەیانی دەکاتەوە».

٢٠٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَتْ عَائِشَةُ ﷺ: لَا تَدَعْ قِيَامَ اللَّيْلِ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ لَا يَدَعُهُ، وَكَانَ إِذَا مَرِضَ، أَوْ كَسِلَ، صَلَّى قَاعِدًا.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەیس دەڵێت: عائیشە ﷺ گوتی: واز لە شەونوێژ نەهێنی لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ وازی لێ نەدەهێنا، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر نەخۆش بووایە، یان ماندوو بووایە نەیتوانیایە، ئەوە بەدانیشتنەوە شەونوێژەکانی دەکرد.



٢١٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ، فَاسْتَعْجَمَ الْقُرْآنُ عَلَى لِسَانِهِ، فَلَمْ يَدْرِ مَا يَقُولُ، فَلْيَضْطَجِعْ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێك لە ئێوە شەو هەستا شەونوێژ بکات، قوڕئانەکە نەهاتە سەر زمانی و قوڕس بوو لەسەری (لەبەر ئەوەی خەوی دەهات، وە نەیزانی چی دەڵێت)، ئەوە با بخەوێت و پاڵکەوێتەوە».

## بَابُ مَنْ نَوَى الْقِيَامَ فَنَامَ

## باسی کەسێك نیەتی هێناوە شەونوێژ بکات کەچی دەخەوێت

٢١١. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنَ امْرِئٍ تَكُونُ

لَهُ صَلَاةٌ بِلَيْلٍ، يَغْلِبُهُ عَلَيْهَا نَوْمٌ، إِلَّا كُتِبَ لَهُ أَجْرُ صَلَاتِهِ، وَكَانَ نَوْمُهُ عَلَيْهِ صَدَقَةً».

عائیشە ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك شەونوێژی هەبن (عادەتی هەمیشەیی بێت کە شەونوێژ بکات)، خەویشی بەسەردا زاڵ بوو، ئەوە بێگومان پاداشتی نوێژەکانی بۆ دەنووسرێت و نووستنەکەش بۆی دەبێت بە خێر و چاکە».

## بَابُ صَلَاةِ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى

### باسی شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە

٢١٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ، صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً، تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پیاوێك پرسیاری شەونوێژی کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: «شەونوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە ترسا (بانگی) بەیانی بەسەردا بێت، یەك ڕکات بکات، شەونوێژەکانی بە ویتر کۆتاییان دێت».

## بَابٌ فِي رَفْعِ الصَّوْتِ بِالْقِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ

### باسێك دەربارەی دەنگ بەرزکردنەوە لە قوڕئانخوێندنی شەونوێژدا

٢١٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: «كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى قَدْرِ مَا يَسْمَعُهُ مَنْ فِي الْحُجْرَةِ، وَهُوَ فِي الْبَيْتِ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ (لە شەودا) کاتێك قورئانی دەخوێند بە ئەندازەیەك دەنگی بەرز دەکردەوە، کە ئەگەر کەسێك لە ماڵەکەیدا بووایە لەنێو ژوورەکەی گوێی لێ دەبوو.

٢١٤. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁ قَالَ: اعْتَكَفَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ، فَسَمِعَهُمْ يَجْهَرُونَ بِالْقِرَاءَةِ، فَكَشَفَ السِّتْرَ، وَقَالَ: «أَلَا إِنَّ كُلَّكُمْ مُنَاجٍ رَبَّهُ، فَلَا يُؤْذِيَنَّ بَعْضُكُمْ بَعْضًا، وَلَا يَرْفَعْ بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الْقِرَاءَةِ»، أَوْ قَالَ: «فِي الصَّلَاةِ».

ئەبو سەعید ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئیعتیکافی کرد لە مزگەوتدا، گوێی لێ بوو هاوەڵان دەنگ بەرز دەکەنەوە لە قورئانخوێندندا، پەردەکەی لابرد و فەرمووی: «ئاگادار بن ئێوە هەمووتان موناجات لەگەڵ پەروەردگاردا دەکەن، هەندێکتان ئازار بە هەندێکی دیکەتان مەگەیەنن، لە قورئانخوێندنیشدا هەندێکتان دەنگ بەرز مەکەنەوە بەسەر هەندێکتاندا»، یان فەرمووی: «لە نوێژدا». (ڕاوییەکە گومانی هەیە).



٢١٥. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْجَاهِرُ بِالْقُرْآنِ، كَالْجَاهِرِ بِالصَّدَقَةِ، وَالْمُسِرُّ بِالْقُرْآنِ، كَالْمُسِرِّ بِالصَّدَقَةِ».

عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەوەی بە دەنگی بەرز قوڕئان دەخوێنێت، وەك ئەوە وایە بەئاشکرا خێری کردبێت، ئەوەیشی بە دەنگی نزم و بەنهێنی قوڕئان دەخوێنێت، وەك ئەوە وایە خێری بەنهێنی کردبێت».

تێبینی:

لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ئەو کەسە بە شێوەیەك دەنگ بەرز بکاتەوە کە پێویست نەبێت، ئەگەرنا دەنگ بەرزکردنەوە بەپێی پێویست و دەنگخۆشی لە قوڕئاندا سوننەت و فەرمانپێکراوە، دەی دەنگی خۆش بەبێ دەنگ بەرزکردنەوە دەرناکەوێت و جێبەجێ نابێت.

## بَابٌ فِي صَلَاةِ اللَّيْلِ

### باسێك دەربارەی شەونوێژ

٢١٦. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ عَشْرَ رَكَعَاتٍ، وَيُوتِرُ بِسَجْدَةٍ، وَيَسْجُدُ سَجْدَتَيِ الْفَجْرِ، فَذَلِكَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً.

عائیشه ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ له شەودا دە ڕكات شەونوێژی دەكرد، بە یەك ڕكات ویتری كرد، وە دوو ڕكاتیش سوننەتی پێش بەیانی دەكرد، كە ئەمە دەكاتە سێزدە ڕكات.

٢١٧. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: «كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ يُصَلِّي إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ بِالصُّبْحِ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ».

عائیشه ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە شەو سێزدە ڕكاتی دەكرد، پاشان ئەگەر گوێی له بانگ بووایه دوو ڕكاتی كورت و پوختی دەكرد.

٢١٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّهُ رَقَدَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَرَآهُ اسْتَيْقَظَ، فَتَسَوَّكَ وَتَوَضَّأَ، وَهُوَ يَقُولُ: «{إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ}»، حَتَّى خَتَمَ السُّورَةَ، ثُمَّ قَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ أَطَالَ فِيهِمَا الْقِيَامَ وَالرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَنَامَ حَتَّى نَفَخَ، ثُمَّ فَعَلَ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ بِسِتِّ رَكَعَاتٍ، كُلُّ ذَلِكَ يَسْتَاكُ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وَيَقْرَأُ هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ، ثُمَّ أَوْتَرَ - قَالَ عُثْمَانُ: بِثَلَاثِ رَكَعَاتٍ فَأَتَاهُ الْمُؤَذِّنُ، فَخَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ، وَقَالَ ابْنُ عِيسَى: ثُمَّ أَوْتَرَ، فَأَتَاهُ بِلَالٌ، فَآذَنَهُ بِالصَّلَاةِ حِينَ طَلَعَ الْفَجْرُ فَصَلَّى رَكْعَتَيِ الْفَجْرِ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلَاةِ، ثُمَّ اتَّفَقَا - وَهُوَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي لِسَانِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي سَمْعِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي بَصَرِي نُورًا، وَاجْعَلْ خَلْفِي نُورًا، وَأَمَامِي نُورًا، وَاجْعَلْ مِنْ فَوْقِي نُورًا، وَمِنْ تَحْتِي نُورًا اللَّهُمَّ، وَأَعْظِمْ لِي نُورًا».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ماوەتەوە و خەوتووە، جا بینیویەتی كەوا هەستاوەتەوە و سیواكی كردووە و دەستنوێژی شوشتووە و فەرموویەتی: «{إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ}»، هەتا كۆتایی سوورەتەكەی خوێندۆتەوە، پاشان هەستا و دوو ڕكات نوێژی كرد كە قورئانخوێندن و ڕكووع و سوجدەی تێدا درێژ كردەوە، پاشان وازی هێنا و خەوت بە جۆرێك پرخەی هات، پاشان سێ جار ئەوەی دووبارە كردۆتەوە بە شەش ڕكات، هەموو جارێك سیواكی دەكرد، پاشان دەستنوێژی دەگرتەوە و ئەو ئایەتانەی دەخوێندەوە، پاشان نوێژی ویتری كرد، - عوسمان گوتوویەتی: بە سێ ڕكات (ویتری) كردووە، ئەوجار بانگبێژەكە هاتە خزمەتی و چوو بۆ نوێژ، ئیبن عیسا گوتی: پاشان ویتری كرد، ئینجا بیلال هات ئاگاداری كرد بۆ نوێژی بەیانی، كاتێك كە بەرەبەیان دەركەوت، ئینجا دوو ڕكاتی (پێش) نوێژی بەیانی كرد، پاشان چوو بۆ نوێژ، پاشان ڕاوییەكان یەكدەنگن كەوا - پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: «اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي لِسَانِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي سَمْعِي نُورًا، وَاجْعَلْ فِي بَصَرِي نُورًا، وَاجْعَلْ خَلْفِي نُورًا، وَأَمَامِي نُورًا، وَاجْعَلْ مِنْ فَوْقِي نُورًا، وَمِنْ تَحْتِي نُورًا اللَّهُمَّ، وَأَعْظِمْ لِي نُورًا، واتە: خوایە نوور بخەیتە دڵمەوە، نوور بخەیتە زمانم، هەروەها نوور بخەیتە گوێمەوە و نوور بخەیتە چاومەوە و دواوە و پێشەوەم و سەر و خواروومم ڕووناك بكەی، خوایە نووری گەورە و شیاوم پێ بدەیت».

٢١٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً بِرَكْعَتَيِ الْفَجْرِ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ سێزدە ڕكات نوێژی دەكرد بە دوو ڕكاتەكەی پێش نوێژی بەیانییەوە.

## بَابُ مَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنَ القَصْدِ فِي الصَّلَاةِ

### باسی فەرمانکردن بە هاوسەنگی لە نوێژدا (نە کورت نە درێژ)

٢٢٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اكْلَفُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ، فَإِنَّ اللَّهَ لَا يَمَلُّ، حَتَّى تَمَلُّوا، وَإِنَّ أَحَبَّ الْعَمَلِ إِلَى اللَّهِ أَدْوَمُهُ، وَإِنْ قَلَّ»، وَكَانَ إِذَا عَمِلَ عَمَلاً أَثْبَتَهُ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەئەندازەی تواناتان لە کار و کردەوە خۆتان ماندوو بکەن، چونکە لە ڕاستیدا خوا ڕووتان لێ وەرناگێڕێت هەتاکوو ئێوە بێزار و بێتاقەت دەبن (لە عیبادەت)، هەروەها خۆشەویستترین کردەوە لەلای خوا ئەو کردەوەیەیە کە بەردەوام بێت، هەرچەند کەمیش بێت»، پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێك کار و کردەوەیەکی دەکرد جێگیر و بەردەوامی دەکرد.

٢٢١. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ إِلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ، فَجَاءَهُ، فَقَالَ: «يَا عُثْمَانُ، أَرَغِبْتَ عَنْ سُنَّتِي»، قَالَ: لَا وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَلَكِنْ سُنَّتَكَ أَطْلُبُ، قَالَ: «فَإِنِّي أَنَامُ وَأُصَلِّي، وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأَنْكِحُ النِّسَاءَ، فَاتَّقِ اللَّهَ يَا عُثْمَانُ، فَإِنَّ لِأَهْلِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِضَيْفِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَإِنَّ لِنَفْسِكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَصُمْ وَأَفْطِرْ، وَصَلِّ وَنَمْ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ناردی بەدوای عوسمانی کوڕی مەزعوندا (کە برای شیری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو)، هات بۆلای، فەرمووی: ئەی عوسمان، ئایا تۆ پشتت لە سوننەتی من کردووە»، گوتی: نەخێر سوێند بە خوا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، بەڵکوو من شوێن سوننەتی تۆ دەکەوم، فەرمووی: «من بەشێك لە شەو دەخەوم و بەشێکی نوێژ دەکەم، ڕۆژ هەیە بەڕۆژووم ڕۆژیش هەیە بەڕۆژوو نیم،

ژنیشم هێناوە، تۆش لە خوا بترسە ئەی عوسمان هاوسەرت مافی بەسەرتەوە هەیە، میوانت مافی بەسەرتەوە هەیە، وە نەفس و لاشەی خۆت مافی بەسەرتەوە هەیە، بۆیە هەندێك ڕۆژ بەڕۆژوو بە، هەندێك ڕۆژوویش بەڕۆژوو مەبە، هەندێك لە شەو بخەوە، هەندێکیشی نوێژ بکە».

## بَابٌ فِي قِيَامِ شَهْرِ رَمَضَانَ

## باسێك دەربارەی شەو زیندووکردنەوە لە مانگی ڕەمەزاندا

٢٢٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ فەرموودەکە دەگەیەنێت بە پێغەمبەر ﷺ (ڕەفعی دەکات، کە فەرموویەتی): «هەر کەسێك مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت، بڕوای وا بێت کە فەرزە لەلایەن خوای گەورەوە، چاوەڕێی پاداشت بێت لە خوا و نیەتی بۆ خوا بێت، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێت، هەر کەسێکیش لە شەوی قەدر شەونوێژ بکات بڕوای وا بێت کە سوننەتە و چاوەڕێی پاداشت بکات لە خوا، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێت».

٢٢٣. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى فِي الْمَسْجِدِ، فَصَلَّى بِصَلَاتِهِ نَاسٌ، ثُمَّ صَلَّى مِنَ الْقَابِلَةِ، فَكَثُرَ النَّاسُ، ثُمَّ اجْتَمَعُوا مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا أَصْبَحَ، قَالَ: «قَدْ رَأَيْتُ الَّذِي صَنَعْتُمْ فَلَمْ يَمْنَعْنِي مِنَ الْخُرُوجِ إِلَيْكُمْ، إِلَّا أَنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ». وَذَلِكَ فِي رَمَضَانَ.

عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ (لە شەوی

ڕەمەزاندا) لە مزگەوتدا نوێژی کرد، کەسانێکیش لە دوایەوە نوێژیان کرد بەکۆمەڵ (واتە تەڕاویح)، بۆ شەوی دواتر دیسان نوێژی کرد، خەڵکی زیاتر (بیستیان) هاتن (بۆ مزگەوت تەڕاویحیان کرد لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەکۆمەڵ)، شەوی سێیەم خەڵکی کۆ بووەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نەهاتە نێویان، جا کە بۆ نوێژی بەیانی هاتە نێویان، فەرمووی: «بینیم و ئاگادار بووم ئەوەی کە ئێوە کردتان، هیچ شتێك ڕێگریی لە من نەکرد کە بێمە نێوتان و پێشنوێژیتان بۆ بکەم تەنها ئەوە نەبێت کە ترسام نەك خوا فەڕزی بکات لەسەرتان (وەکوو ڕەحمەتێك بە ئوممەتەکەی)»، ئەمەش لە ڕەمەزاندا بووە.

## بَابٌ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ

### باسێك دەربارەی شەوی قەدر

٢٢٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فِي تَاسِعَةٍ تَبْقَى، وَفِي سَابِعَةٍ تَبْقَى، وَفِي خَامِسَةٍ تَبْقَى».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمووی: «ئێوە بەدوای شەوی قەدردا بگەڕێن لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان، نۆ ڕۆژی بمێنێت و حەوتی بمێنێت و پێنجی بمێنێت».

## أَبْوَابُ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ وَتَحْزِيبِهِ وَتَرْتِيلِهِ

باسەکانی بەشبەشکردنی قورئان و بە تەرتیل خوێندنەوەی قورئان

## بَابٌ فِي كَمْ يُقْرَأُ الْقُرْآنُ

باسێك دەربارەی ئەوەی کە لە چەند ڕۆژدا قورئان بخوێندرێت

٢٢٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: «اقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ»، قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ: «اقْرَأْ فِي عِشْرِينَ»، قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ: «اقْرَأْ فِي خَمْسَ عَشْرَةَ»، قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ: «اقْرَأْ فِي عَشْرٍ»، قَالَ: إِنِّي أَجِدُ قُوَّةً، قَالَ: «اقْرَأْ فِي سَبْعٍ، وَلَا تَزِيدَنَّ عَلَى ذَلِكَ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە: «بەردەوام مانگی جارێك قورئان خەتم بکە»، گوتی: من توانام لەوە زیاترە (دەتوانم زیاتر بخوێنم)، فەرمووی: «لە بیست ڕۆژدا بیخوێنە (و خەتم بکە)»، گوتی: من توانام لەوە زیاترە، فەرمووی: «لە پازدە ڕۆژدا بیخوێنە (و خەتم بکە)»، گوتی: من توانام لەوە زیاترە، فەرمووی: «لە دە ڕۆژدا بیخوێنە (و خەتم بکە)»، گوتی: من توانام لەوە زیاترە، فەرمووی: «لە حەوت ڕۆژدا بیخوێنە (و خەتم بکە)، لەوە زیاتر نا».

٢٢٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صُمْ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ، وَاقْرَإِ الْقُرْآنَ فِي شَهْرٍ»، فَنَاقَصَنِي وَنَاقَصْتُهُ، فَقَالَ «صُمْ يَوْمًا، وَأَفْطِرْ يَوْمًا»، قَالَ عَطَاءٌ: وَاخْتَلَفْنَا عَنْ أَبِي، فَقَالَ بَعْضُنَا: سَبْعَةَ أَيَّامٍ، وَقَالَ بَعْضُنَا: خَمْسًا

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: «لە هەموو مانگێکدا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە، قورئانیش (بەتەواوی) بخوێنە لە مانگێکدا»،

ئیدی من هەر داوام کرد و پێم کەم بوو، ئەویش (کاتەکەی) بۆ کەم کردمەوە و فەرمووی: «ڕۆژێك بەڕۆژوو بە و ڕۆژێك بەڕۆژوو مەبە»، عەتاء دەڵێت: لەگەڵ بابم جیاواز بووین یەکێکمان دەیگوت: (بۆ قوڕئانخوێندنەکە بۆی کرد بە) حەوت ڕۆژ، یەکێکیشمان دەیگوت: پێنج ڕۆژ.

٢٢٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ يَعْنِي ابْنَ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَفْقَهُ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك قوڕئان خەتم بکات لە کەمتر لە سێ ڕۆژ، ئەوا لێی تێناگات».

٢٢٨. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا مَسْعُودٍ ﵁ وَهُوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، فَقَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَرَأَ الْآيَتَيْنِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید دەڵێت: پرسیارم کرد لە ئەبو مەسعوود ﵁ تەوافی بەدەوری کەعبەدا دەکرد، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەر کەسێك دوو ئایەتی کۆتایی سووڕەتی بەقەڕە لە شەودا بخوێنێت (پێش خەوتن) ئەوە بەسیەتی».

## بَابُ تَفْرِيعِ أَبْوَابِ السُّجُودِ، وَكَمْ سَجْدَةً فِي الْقُرْآنِ

باسی ئەو بابەتانەی پەیوەندی بە سوجدەوە هەیە و
چەند سوجدەی قورئانخوێندن هەیە لە قورئاندا

## بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا سَجَدَ

باسی ئەوەی دەگوترێت لە سوجدەدا

٢٢٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي سُجُودِ الْقُرْآنِ بِاللَّيْلِ، يَقُولُ فِي السَّجْدَةِ مِرَارًا: «سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کڕنووشی قورئانخوێندندا بە شەو چەند جارێك دەیفەرموو: «(سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ، وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ، بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ)، واتە: ڕووم کڕنووشی برد بۆ ئەو خوایەی کە دروستی کردووە و هەستەوەری بیستن و بینینی پێ بەخشیوە بەهێز و توانای خۆی».

## بَابُ تَفْرِيعِ أَبْوَابِ الْوِتْرِ

باسی ئەو بابەتانەی پەیوەندی بە ویترەوە هەیە

## بَابُ اسْتِحْبَابِ الْوِتْرِ

باسی بەڵگەی ئەوە کە ویتر سونەتە

٢٣٠. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ، أَوْتِرُوا، فَإِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ، يُحِبُّ الْوِتْرَ».

عەلی ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەی ئەهلی قورئان ویتر بکەن، لەبەر ئەوەی خوا تاکە و تاکی خۆش دەوێت».

## بَابُ الْقُنُوتِ فِي الْوِتْرِ

### باسی قونووت خوێندن لە ویتردا

٢٣١. عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ ﷛: عَلَّمَنِي رَسُولُ ﷺ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الْوِتْرِ، - قَالَ ابْنُ جَوَّاسٍ: فِي قُنُوتِ الْوِتْرِ: - «اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، إِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، وَلَا يَعِزُّ مَنْ عَادَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ».

حەسەنی کوڕی عەلی ﷛ (دەڵێت): پێغەمبەری خوا ﷺ چەند وشەیەکی فێر کردم لە ویتردا بیانخوێنم، -ئیبن جەوواس دەڵێت: لە قونووتی ویتردا- (فێری کردووم بڵێم): «خوایە هیدایەتم بدەی لەنێو ئەو کەسانەی کە هیدایەتت داون، وە بمپارێزیت لە هەموو هەوا و ئارەزوو و ڕەوشت و بەڵایەك لە کۆی ئەو کەسانەی کە پاراستوونت، خوایە خۆت سەرپەرشتیاری کاروبارم بکەی لەنێو ئەو کەسانەی کە خۆت سەرپەرشتیاری کاروباریان دەکەیت و نایدەیتە دەست خۆیان، لە هەر شتێك کە پێت بەخشیوم بەرەکەتی تێ بکەیت، خوایە بمپارێزە لەخراپەی هەر شتێك کە تۆ بڕیارت داوە، هەر تۆ بڕیار دەدەی کەس نییە بڕیار بەسەر تۆدا بدات، هەر کەسێك تۆ سەرپەرشتی بکەیت و خۆشت بوێت کەس ناتوانێت زەلیلی بکات، هەر کەسێك تۆ دژایەتی بکەیت کەس ناتوانێت بەهێز و باڵادەستی بکات، خێر و بەرەکەتی تۆ لە دونیا و قیامەت گەلێك زۆرە و بەرز و بڵندی لە ناو و سیفەت و کردەوەکانتدا».

## بَابٌ فِي وَقْتِ الْوِتْرِ

### باسێك دەربارەی کاتی ویتر

٢٣٢. عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ ﵂: مَتَى كَانَ يُوتِرُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَتْ: كُلَّ ذَلِكَ قَدْ فَعَلَ، أَوْتَرَ أَوَّلَ اللَّيْلِ، وَوَسَطَهُ، وَآخِرَهُ، وَلَكِنِ انْتَهَى وِتْرُهُ حِينَ مَاتَ إِلَى السَّحَرِ.

مەسڕووق دەڵێت: بە عائیشەم ﵂ گوت: پێغەمبەری خوا ﷺ کەی ویترەکەی دەکرد؟ گوتی: بە هەموو شێوازێك و لە هەموو کاتێکدا کردوویەتی، جاری وا بووە لە سەرەتای شەودا کردوویەتی، وە جاری وا هەبووە لە نێوەڕاستی شەودا، وە جاری وا هەبووە لە کۆتایی شەودا، بەڵام لە کۆتایی تەمەنیدا زیاتر ویترەکەی دەگەیشتە کاتی بەرەبەیان (لە کۆتایی شەودا دەیکرد).

٢٣٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْرًا».

ئیبن عومەر ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «با دوا نوێژتان لە شەودا ویتر بێت».

٢٣٤. عَنِ الْبَرَاءِ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْنُتُ فِي صَلَاةِ الصُّبْحِ، زَادَ ابْنُ مُعَاذٍ: وَصَلَاةِ الْمَغْرِبِ.

بەڕاء ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانیدا قونووتی دەخوێند، ئیبن موعاز ئەمەی زیاد کردووە: وە لە نوێژی مەغریبیشدا.

## بَابُ الْحَثِّ عَلَى قِيَامِ اللَّيْلِ

### باسی هاندان بۆ شەونوێژ

٢٣٥. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ ﵄ قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اسْتَيْقَظَ مِنَ اللَّيْلِ وَأَيْقَظَ امْرَأَتَهُ، فَصَلَّيَا رَكْعَتَيْنِ جَمِيعًا، كُتِبَا مِنَ الذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا، وَالذَّاكِرَاتِ».

ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو هوڕەیڕە ﵄ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك بە شەو هەڵسێت و خێزانەکەشی هەڵسێنێت دوو ڕکات نوێژ بەیەکەوە بکەن، ئەوە ناونووس دەکرێن لەو ژن و پیاوانەی کە زۆر زیکری خوا دەکەن».

## بَابٌ فِي ثَوَابِ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ

### باسێك دەربارەی پاداشتی قوڕئانخوێندن

٢٣٦. عَنْ عُثْمَانَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ».

عوسمان ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «باشترینتان ئەو کەسەیە کە خۆی فێری قوڕئان ببێت و خەڵکیش فێری قوڕئان بکات».

٢٣٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا اجْتَمَعَ قَوْمٌ فِي بَيْتٍ مِنْ بُيُوتِ اللَّهِ تَعَالَى، يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ وَيَتَدَارَسُونَهُ بَيْنَهُمْ، إِلَّا نَزَلَتْ عَلَيْهِمُ السَّكِينَةُ، وَغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ، وَحَفَّتْهُمُ الْمَلَائِكَةُ، وَذَكَرَهُمُ اللَّهُ فِيمَنْ عِنْدَهُ».

ئەبو هوڕەیڕە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هیچ کۆمەڵە کەسانێك نین لە ماڵێك لە ماڵەکانی خوای بەرزدا دابنیشن، کتێبەکەی خوا

بخوێننەوەو دیراسەی بکەن و شی بکەنەوە و لێکی بدەنەوە، مسۆگەر هێمنی و ئارامی و ڕەحمەت دادەبەزێتە سەریان، وە ڕەحمەتی خوا دایاندەپۆشێت، فریشتەکان (فریشتەی ڕەحمەت) دەوریان دەگرن، وە خوا لەلای فریشتە بەڕێزەکان باسیان دەکات (واتە: سەنا و ستاییشیان دەکات)».

## بَابُ فَاتِحَةِ الْكِتَابِ

### باسی سوورەتی فاتیحە

٢٣٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، أُمُّ الْقُرْآنِ، وَأُمُّ الْكِتَابِ، وَالسَّبْعُ الْمَثَانِي».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ)، بنچینەی هەموو ئایەتەکانی قورئانە، گەورەی هەموو پەرتووکەکەیە و ژمارەی ئایەتەکانی حەوتە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي آيَةِ الْكُرْسِيِّ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئایەتی کورسی

٢٣٩. عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ ﷺ: «أَبَا الْمُنْذِرِ، أَيُّ آيَةٍ مَعَكَ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ أَعْظَمُ؟»، قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «أَبَا الْمُنْذِرِ، أَيُّ آيَةٍ مَعَكَ مِنْ كِتَابِ اللَّهِ أَعْظَمُ؟»، قَالَ: قُلْتُ: {اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ} البقرة: ٢٥٥. قَالَ: فَضَرَبَ فِي صَدْرِي، وَقَالَ: «لِيَهْنِ لَكَ يَا أَبَا الْمُنْذِرِ الْعِلْمُ».

ئوبەی کوڕی کەعب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەی باوکی

مونزیر، چ ئایەتێکت لەبەرە یان لەلایە لە کتێبی خوا کە گەورەترین ئایەت بێت (واتە: خوێندنی پاداشتی زیاتر بێت)؟»، دەڵێت: گوتم: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی: «ئەی باوکی مونزیر، چ ئایەتێکت لەلایە گەورەترین ئایەت بێت لە کتێبی خوای گەورە؟»، دەڵێت: گوتم: {اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ}، دەستی دا بە سینگمدا و فەرمووی: «زانست و زانیاری دەست تۆ بکەوێت بەئاسانی و بەبێ ماندووبوون ئەی باوکی مونزیر».

## بَابٌ فِي سُورَةِ الصَّمَدِ

### باسێك دەربارەی پێگەی سوورەتی ئیخلاص

٢٤٠. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁: أَنَّ رَجُلاً سَمِعَ رَجُلاً يَقْرَأُ: قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ يُرَدِّدُهَا، فَلَمَّا أَصْبَحَ جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرَ لَهُ، وَكَأَنَّ الرَّجُلَ يَتَقَالُّهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێك گوێی لە پیاوێکی دیکە بوو سوورەتی ئیخلاصی دەخوێند و دووبارەی دەکردەوە، بەیانی کردەوە پیاوەکە هات بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کرد، گوتی: پیاوێك هەر سوورەتی ئیخلاصی دەخوێند و دووبارەی دەکردەوە، وەکوو ئەوەی ئەو بەکەمی بزانێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە، سوورەتی ئیخلاص (پاداشتەکەی) بەرانبەرە بە سێیەکی قورئان».

٢٤١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﵁ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ وَهُوَ عَلَى نَاقَةٍ يَقْرَأُ بِسُورَةِ الْفَتْحِ، وَهُوَ يُرَجِّعُ.

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە ڕۆژی

فەتحی مەککەدا، لەسەر حوشترەکەی بوو، سوورەتی فەتحی دەخوێند و تەرجیعی دەکرد (واتە: بە دەنگی خۆش و تەرتیلەوە دەیخوێند).

٢٤٢. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ».

بەرائی کوڕی عازیب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «قورئان جوانتر بکەن بە دەنگتان (بە دەنگی خۆشتان و بە تەجویدەکەی)».

٢٤٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا أَذِنَ اللَّهُ لِشَيْءٍ، مَا أَذِنَ لِنَبِيٍّ حَسَنِ الصَّوْتِ يَتَغَنَّى بِالْقُرْآنِ، يَجْهَرُ بِهِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوای پەروەردگار گوێبیستی بۆ هیچ شتێك نەکردووە وەك گوێبیستی بۆ پێغەمبەرێکی دەنگخۆش لە کاتێکدا کە قورئان دەخوێنێت و دەنگی پێی بەرز دەکاتەوە».



## بَابُ الدُّعَاءِ

## باسی دوعا و پاڕانەوە

٢٤٤. عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الدُّعَاءُ هُوَ الْعِبَادَةُ، {قَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ} غافر: ٦٠».

نوعمانی کوڕی بەشیر ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «پاڕانەوە بریتییە لە عیبادەت، خوا فەرموویەتی: {قَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ}، داوام لێ بکەن و لێم بپاڕێنەوە منیش وەڵامتان دەدەمەوە».

٢٤٥. أَنَّ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ ﵁ صَاحِبَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: سَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ

رَجُلًا يَدْعُو فِي صَلَاتِهِ لَمْ يُمَجِّدِ اللَّهَ تَعَالَى، وَلَمْ يُصَلِّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَجِلَ هَذَا»، ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ لَهُ - أَوْ لِغَيْرِهِ -: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ، فَلْيَبْدَأْ بِتَمْجِيدِ رَبِّهِ جَلَّ وَعَزَّ، وَالثَّنَاءِ عَلَيْهِ، ثُمَّ يُصَلِّي عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ يَدْعُو بَعْدُ بِمَا شَاءَ».

فەزالەی کوڕی عوبەید ﷺ هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لێ بوو پیاوێك لە کۆتایی (یان لەدوای) نوێژەکەیدا دوعای دەکرد، بەڵام حەمد و سەنا و ستاییشی خوای بەرزی نەکرد و صەڵاواتی لەسەر پێغەمبەر ﷺ نەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەمە پەلەی کرد»، پاشان بانگی کرد پێی فەرموو، -یان بە جگە لە ئەوی فەرموو-: «ئەگەر یەکێکتان نوێژی کرد، با حەمد و سەنا و ستاییشی خوا بکات، پاشان صەڵاوات بدات لەسەر پێغەمبەر ﷺ، پاشان چ دوعایەك ویستی لێ بوو با بیکات و بپاڕێتەوە (ئاوا زیاتر نزاکە گیرا دەبێت)».

٢٤٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، فَيَقُولُ: قَدْ دَعَوْتُ، فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دوعای هەر یەکێك لە ئێوە وەڵام دەدرێتەوە مادام پەلە نەکات، (پەلەکردنیش ئەوەیە کە یەکێك) دەڵێت: دوعام کرد و وەڵام نەدرامەوە».

٢٤٧. عَنْ سَلْمَانَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ رَبَّكُمْ ﷻ حَيِيٌّ كَرِيمٌ، يَسْتَحْيِي مِنْ عَبْدِهِ إِذَا رَفَعَ يَدَيْهِ إِلَيْهِ، أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْرًا».

سەلمانی فارسی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان پەروەردگارتان ﷻ بەشەرمە (وەك چۆن کەسێك شەرم بکات و نەتوانێت نەبەخشێت کاتێك داوای لێ دەکەن)، بەڕێزیشە (ڕێز لە بەندەی خۆی دەگرێت و پێی دەبەخشێت)، پێیناخۆشە ئەگەر بەندەیەکی دەستەکانی بۆ لای بەرز بکاتەوە و

لێی بپارێتەوە ڕەتی بکاتەوە بە بەتاڵی».

٢٤٨. عن عَبْد اللَّهِ بْن بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ سَمِعَ رَجُلًا يَقُولُ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ أَنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللَّهُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، الْأَحَدُ الصَّمَدُ الَّذِي لَمْ يَلِدْ، وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ، فَقَالَ: «لَقَدْ سَأَلْتَ اللَّهَ بِالِاسْمِ الَّذِي إِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى، وَإِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ».

عەبدوڵڵای کوڕی بوڕەیدە، لە باوکییەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە پیاوێك بوو دەیگوت: خوایە من داوا لە تۆ دەکەم، من شایەتی دەدەم کە تۆ تاك و تەنهای، بێهاوتای، بەتەنها شایەنی پەرستنی، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە شایەنی پەرستن بێ جگە لە تۆ، تاك و تەنهایت و هەموو کەس پێویستی بە تۆیە، تۆ پێویستت بە کەس نییە، کەست لێ نەبووە، لە کەس نەبوویت و هیچ کەسێك هاوشێوەی تۆ نییە، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «بەدڵنیایی داوات لە خوا کرد بەو ناوەی کە ئەگەر داوای پێ بکرێت دەیبەخشێت، دوعای پێ بکرێت وەڵامی دەداتەوە».

## بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا سَلَّمَ

### باسی ئەوەی کە دەگوترێت دوای سەلامدانەوە

٢٤٩. عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا انْصَرَفَ مِنَ الصَّلَاةِ، يَقُولُ: «لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ، وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ، أَهْلُ النِّعْمَةِ وَالْفَضْلِ وَالثَّنَاءِ الْحَسَنِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ، وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ».

ئەبو زوبەیر دەڵێت: گوێم لە عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر رضي الله عنهما بوو لەسەر مینبەر دەیگوت:

پێغەمبەر ﷺ لە نوێژ تەواو بووایە دەیفەرموو: «(لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ، وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ، وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ، أَهْلُ النِّعْمَةِ وَالْفَضْلِ وَالثَّنَاءِ الْحَسَنِ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ، وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ)، واتە: هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، تاك و تەنهایە و هیچ هاوبەشێکی نییە، هەموو موڵك و ستاییشێك هەر بۆ ئەوە، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، بەدڵسۆزییەوە پەرستش و عیبادەت و دینداری بۆ دەکەین، با بێبڕوایانیش پێیانناخۆش بێت، هەر خوا خاوەنی هەموو نیعمەتەکانە، ئەو دەبەخشێت، ئەو ئەهلی فەزڵ و چاکە و مەدح و سەنا و ستاییشی چاکە، بەدڵسۆزییەوە پەرستش و عیبادەت و دینداری بۆ دەکەین، با بێبڕوایانیش پێیانناخۆش بێت».

٢٥٠. عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا سَلَّمَ مِنَ الصَّلَاةِ، قَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، وَمَا أَسْرَفْتُ وَمَا أَنْتَ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي، أَنْتَ الْمُقَدِّمُ وَأَنْتَ الْمُؤَخِّرُ، لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر سەلامی بدایاتەوە لە نوێژ دەیفەرموو: «خوایە لێم خۆش بە، لە هەموو ئەو گوناهانەی کە پێشتر کردوومە، لەوانەش کە دوام خستووە یان کەمتەرخەمییەکم هەبووە، لەوەی کە بەنهێنی کردوومە و ئەوەی کە بەئاشکرا کردوومە، ئەوەش کە زێدەڕۆییم کردووە، ئەوەی کە تۆ خۆت زاناتر و شارەزاتری پێی لە من، خوایە تۆ هەر کەسێك پێش بخەیت بە ویستی خۆت پێشی دەخەیت و هەر کەسێکیش دوا بخەی بە ویستی خۆت دوای دەخەیت، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە شایەنی پەرستن بێ جگە لە تۆ».

٢٥١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدْعُو: «رَبِّ أَعِنِّي وَلَا تُعِنْ عَلَيَّ، وَانْصُرْنِي وَلَا تَنْصُرْ عَلَيَّ، وَامْكُرْ لِي وَلَا تَمْكُرْ عَلَيَّ، وَاهْدِنِي وَيَسِّرْ هُدَايَ إِلَيَّ، وَانْصُرْنِي عَلَى مَنْ بَغَى عَلَيَّ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي لَكَ شَاكِرًا، لَكَ ذَاكِرًا، لَكَ رَاهِبًا، لَكَ

مِطْوَاعًا إِلَيْكَ، مُخْبِتًا، أَوْ مُنِيبًا، رَبِّ تَقَبَّلْ تَوْبَتِي، وَاغْسِلْ حَوْبَتِي، وَأَجِبْ دَعْوَتِي، وَثَبِّتْ حُجَّتِي، وَاهْدِ قَلْبِي، وَسَدِّدْ لِسَانِي، وَاسْلُلْ سَخِيمَةَ قَلْبِي».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ دوعای دەکرد: «خوایە یارمەتیم بدە و سەرکەوتووم بکە، یارمەتی کەس مەدە بەسەر مندا (زاڵ بێت)، بەسەر بێبڕوایان زاڵم بکە، ئەوان بەسەر مندا زاڵ مەکە، نەخشە و پلان بۆ من بکە دژی وان، بۆ ئەوان دژی من مەیکە، ڕێنموویم بکە و ڕێنموویشم بۆ ئاسان بکە، خوایە هەر کەسێك ستەمی لێ کردووم بەسەریدا سەرم بخە، خوایە وام لێ بکە هەموو کات سوپاسگوزارت بم، هەموو کات زیکری تۆ بکەم، لە تۆ بترسێم لە نهێنی و ئاشکرادا، زۆر گوێڕایەڵی تۆ بم، خشوع و تەوازوعم بۆ تۆ هەبێت، بۆلای تۆ بگەڕێمەوە، خوایە تەوبەم لێ وەربگرە، خوایە گوناهم بشۆرەوە، وەڵامم بدەرەوە، بەڵگەم جێگیر بکە، هیدایەتی دڵم بدە، زمانم ڕێك و ڕاست بکە (بە گوتنی هەق)، ئەو نەخۆشییانەی لە دڵمدا هەیە خوایە هەمووی دەربکە».



## بَابٌ فِي الِاسْتِغْفَارِ

### باسێك دەربارەی داوای لێخۆشبوون کردن

٢٥٢. عَنِ الْأَغَرِّ الْمُزَنِيِّ ﵁ - وَكَانَتْ لَهُ صُحْبَةٌ - قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي، وَإِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي كُلِّ يَوْمٍ مِائَةَ مَرَّةٍ».

ئەغەرری موزەنی ﵁ -کە لە هاوەڵان بووە- دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جاری وایە منیش حاڵەتێکم بۆ دروست دەبێت کە تێبکەوم ئەوەی کە بەسەر مرۆڤدا دێت دڵم بێ ئاگا بێت، هەموو ڕۆژێك من سەد جار داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم».

٢٥٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي الْمَجْلِسِ الْوَاحِدِ مِائَةَ مَرَّةٍ: «رَبِّ اغْفِرْ لِي، وَتُبْ عَلَيَّ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: ئێمە لە یەك كۆڕ و مەجلیسدا سەد جار دەمانژمارد پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم زیكرەی دەكرد: «(رَبِّ اغْفِرْ لِي، وَتُبْ عَلَيَّ، إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ)، واتە: خوایە لێم خۆش بە و تەوبەم لێ وەربگرە، بەڕاستی تۆ زۆر تەوبەوەرگر و زۆر بەبەزەییت».

٢٥٤. عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ قَالَ: سَأَلَ قَتَادَةُ، أَنَسًا ﵁ أَيُّ دَعْوَةٍ كَانَ يَدْعُو بِهَا رَسُولُ ﷺ أَكْثَرُ، قَالَ: كَانَ أَكْثَرُ دَعْوَةٍ يَدْعُو بِهَا: «اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ».

عەبدولعەزیزی كوڕی صوهەیب دەڵێت: قەتادە پرسیاری كرد لە ئەنەس ﵁: پێغەمبەر ﷺ چ دوعایەكی زۆر دەكرد؟ گوتی: زۆرترین دوعای ئەوەبوو: «(اللَّهُمَّ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً، وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّار)، واتە: خوایە لە دونیادا چاكەمان پێ ببەخشە، (لە هەموو ناز و نیعمەت و هەموو شتێك كە چاك بێت)، لە قیامەتیشدا چاكەمان پێ ببەخشە (لەدوای مردن)، لە سزای ئاگری دۆزەخیش بمانپارێزە».

٢٥٥. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ ﷺ أَخَذَ بِيَدِهِ، وَقَالَ: «يَا مُعَاذُ، وَاللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ، وَاللَّهِ إِنِّي لَأُحِبُّكَ»، فَقَالَ: «أُوصِيكَ يَا مُعَاذُ لَا تَدَعَنَّ فِي دُبُرِ كُلِّ صَلَاةٍ تَقُولُ: اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ، وَشُكْرِكَ، وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ».

موعازی كوڕی جەبەل ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرت (وەكوو خۆشویستنێك) و فەرمووی: «ئەی موعاز! سوێند بە خوا خۆشم دەوێیت، سوێند بە خوا خۆشم دەوێیت»، پاشان فەرمووی: «ئەی موعاز وەسییەتت بۆ دەكەم واز نەهێنیت لەم پاڕانەوەیە، لەدوای هەموو نوێژێك، بڵێ: خوایە یارمەتیم بدە لەسەر یادكردن و سوپاسگوزاریكردن و باش پەرستنت».

٢٥٦. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ أَقْرَأَ بِالْمُعَوِّذَاتِ دُبُرَ كُلِّ صَلَاةٍ.

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردم لەدوای هەموو نوێژە (فەرزە)کان سووڕەتی (الناس) و سووڕەتی (الفلق) بخوێنم.

٢٥٧. عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَالَ: رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك بڵێت: ڕازیم بە پەروەردگارییەتی (الله)، بە ئایینی ئیسلام، بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد، ئەوە بەهەشتی بۆ پێویست دەبێت».



٢٥٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً، صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك یەك صەڵاوات لەسەر من بدات، خوای گەورە دە جار صەڵاوات لەسەر ئەو کەسە دەدات».

تێبینی:

صەڵاوات لەلایەن خواوە، واتە: ڕەحمەت و سۆز و بەزەیی و بەخشندەیی.

## بَابُ النَّهْيِ عَنْ أَنْ يَدْعُوَ الْإِنْسَانُ عَلَى أَهْلِهِ وَمَالِهِ

## باسی ناپەسندی دوعاکردنی خراپ لە منداڵ و ماڵ و سامانی خۆت

٢٥٩. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ،

وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَوْلَادِكُمْ، وَلَا تَدْعُوا عَلَى خَدَمِكُمْ، وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ، لَا تُوَافِقُوا مِنَ اللَّهِ ﷻ سَاعَةَ نَيْلٍ فِيهَا عَطَاءٌ، فَيَسْتَجِيبَ لَكُمْ».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دوعا لە خۆتان مەکەن، دوعا لە منداڵەکانتان مەکەن، دوعا لە خزمەتکارتان مەکەن، دوعا لە ماڵ و سەروەت و سامانتان مەکەن (بە لەناوچوون)، نەوەکوو ئەو کاتەی کە تۆ دوعا دەکەیت بکەوێتە ئەو کاتەی کە خوا ﷻ دوعای تێدا وەردەگرێت».

## بَابُ الصَّلَاةِ عَلَى غَيْرِ النَّبِيِّ ﷺ

### باسی صەڵاواتدان لەسەر غەیری پێغەمبەر ﷺ (ئایا دروستە یان نا؟)



٢٦٠. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّ امْرَأَةً قَالَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ: صَلِّ عَلَيَّ وَعَلَى زَوْجِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «صَلَّى اللَّهُ عَلَيْكِ وَعَلَى زَوْجِكِ».

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێك گوتی: ئەی پێغەمبەر ﷺ صەڵاوات لەسەر خۆم و لەسەر مێردەکەم بدە (صەڵاوات: واتە: دوعای خێر)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «خوا صەڵاوات لەسەر خۆت و لەسەر مێردەکەشت بدات».

## بَابُ الدُّعَاءِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ

### باسی دوعا کردن بەنهێنی بۆ موسوڵمان

٢٦١. عن أُمِّ الدَّرْدَاءِ، قَالَتْ: حَدَّثَنِي سَيِّدِي أَبُو الدَّرْدَاءِ ﷺ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا دَعَا الرَّجُلُ لِأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ، قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ: آمِينَ، وَلَكَ بِمِثْلٍ».

ئوم دەرداء دەڵێت: گەورەم ئەبو دەرداء (ی هاوسەرم) ﵁ بۆی گێڕامەوە: گوێی لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «کاتێك کە کەسێك دوعا بۆ برایەکی موسوڵمانی بکات بەنهێنی، ئەوە فریشتەکان دەڵێن: ئامین، ئەو دوعایەی بۆ ئەوت کردووە هاوشێوەی ئەوە بۆ خۆشت».

## بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا خَافَ قَوْمًا

## باسی کەسێك کە لە کەسانێك بترسێت چی دەڵێت؟

٢٦٢. عَنْ أَبِي بُرْدَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁: أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا خَافَ قَوْمًا، قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنَّا نَجْعَلُكَ فِي نُحُورِهِمْ، وَنَعُوذُ بِكَ مِنْ شُرُورِهِمْ».

ئەبو بوردەی کوڕی عەبدوڵڵا ﵁ دەگێڕێتەوە: باوکی بۆی گێڕاوەتەوە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لە کەسانێك بترسایە دەیفەرموو: «خوایە ئێمە دەتکەین بەگژیاندا (لەبەر ئەوەی ئەوان بە گەردەنیان ڕووبەڕووی مرۆڤـ دەبنەوە)، پەنا بە تۆ دەگرین لە شەڕ و خراپەیان (لە شەڕ و خراپەیان بمانپارێزە، تۆ خۆت وەڵامیان بدەیتەوە و لەناویان بەریت)».

## بَابٌ فِي الِاسْتِعَاذَةِ

## باسێك دەربارەی پەناگرتن

٢٦٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْعَجْزِ وَالْكَسَلِ، وَالْجُبْنِ وَالْبُخْلِ، وَالْهَرَمِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ».

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «خوایە پەنا بە

تۆ دەگرم لە بێدەسەڵاتی و تەمبەڵی و ترسنۆکی و ڕەزیلی و ئەوپەڕی تەمەن پیری (کە مرۆڤـ عەقڵی لەدەست بدات وەکوو منداڵی لێ بێت)، خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە سزای نێو گۆڕ، پەنا بە تۆ دەگرم لە فیتنەی ژیان و مردن».

٢٦٤. عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ ﷺ كَانَ يُعَلِّمُهُمْ هَذَا الدُّعَاءَ كَمَا يُعَلِّمُهُمُ السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّمَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری ئەم دوعایانەی دەکردن، هەر وەکوو چۆن فێری سوورەتێکی قورئانی دەکردن، دەیفەرموو: «خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە سزای دۆزەخ، پەنا بە تۆ دەگرم لە سزای نێو گۆڕ، پەنا بە تۆ دەگرم لە فیتنەی مەسیحی دەججال (ئەگەر پێی بگەم)، پەنا بە تۆ دەگرم لە فیتنەی ژیان و مردن».



٢٦٥. عَن أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ ﷺ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْأَرْبَعِ، مِنْ عِلْمٍ لَا يَنْفَعُ، وَمِنْ قَلْبٍ لَا يَخْشَعُ، وَمِنْ نَفْسٍ لَا تَشْبَعُ، وَمِنْ دُعَاءٍ لَا يُسْمَعُ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە چوار شت، لە زانستێك کە سوودی نەبێت، لە دڵێك کە ترسی تۆی تێدا نەبێت، لە نەفسێك کە تێر نەبێت، لە دوعایەك کە نەبیسترێت (وەڵامی نەدەیتەوە)».

٢٦٦. قَالَ أَبُو الْمُعْتَمِرِ: أُرَى أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رضي الله عنه حَدَّثَنَا: أَنَّ رَسُولَ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ صَلَاةٍ لَا تَنْفَعُ».

ئەبو موعتەمیر دەڵێت: پێم وایە ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه بوو بۆی گێڕاینەوە:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوایە پەنا دەگرم بە تۆ لە هەر نوێژێك كە سوودی (عیبادەتی) نەبێت».

٢٦٧. عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ الْأَشْجَعِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، عَمَّا كَانَ رَسُولُ ﷺ يَدْعُو بِهِ، قَالَتْ: كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا عَمِلْتُ، وَمِنْ شَرِّ مَا لَمْ أَعْمَلْ».

فەڕوەی كوڕی نەوفەلی ئەشجەعی دەڵێت: پرسیارم كرد لە عائیشەی دایكی بڕواداران رَضِيَ اللهُ عَنْهَا كە پێغەمبەری خوا ﷺ چ دوعایەكی دەكرد، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دوعایەی دەكرد: «خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە خراپەی هەر كردەوەیەك كە كردبێتم (لێم خۆش بیت)، لە خراپەی هەر كردەوەیەك كە نەمكردبێت بمپارێزیت (لە داهاتوو)».

٢٦٨. عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبَرَصِ، وَالْجُنُونِ، وَالْجُذَامِ، وَمِنْ سَيِّئِ الْأَسْقَامِ».

ئەنەس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: «خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە بەڵەكی و شێتی و گەڕوگولی، پەنا بە تۆ دەگرم لە هەموو نەخۆشییەكی خراپ».

# كِتَابُ الزَّكَاةِ

## پەرتووکی زەکات

### بَابُ مَا تَجِبُ فِيهِ الزَّكَاةُ

### باسی ئەو شتانەی زەکاتیان تێدا واجبە

٢٦٩. عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر لە پێنج حوشتر کەمتر بوو زەکاتی تێدا نییە (ئەگەر پێنج بوو زەکاتەکەی یەك مەڕە)، ئەگەر کەسێك لە پێنج ئۆقیە کەمتر زیوی هەبوو زەکاتی تێدا نییە (پێنج ئۆقیە دەکاتە چل درهەم، چل جاران پێنج دەکاتە دوو سەد درهەم، ئەگەر کەسێك دوو سەد مسقال زیوی هەبێت، پێویستە زەکاتی بدات)، ئەگەر کەسێك لە دانەوێڵەدا پێنج وەسەق کەمتری هەبوو زەکاتی تێدا نییە».

## بَابُ الْكَنْزِ مَا هُوَ؟ وَزَكَاةِ الْحُلِيِّ

### باسی ئەوەی کە کەنز چییە؟ هەروەها باسی زەکاتی خشڵ

٢٧٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادِ بْنِ الْهَادِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عَائِشَةَ ﵂، زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَرَأَى فِي يَدَيَّ فَتَخَاتٍ مِنْ وَرِقٍ، فَقَالَ: «مَا هَذَا يَا عَائِشَةُ؟»، فَقُلْتُ: صَنَعْتُهُنَّ أَتَزَيَّنُ لَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «أَتُؤَدِّينَ زَكَاتَهُنَّ؟»، قُلْتُ: لَا، أَوْ مَا شَاءَ اللَّهُ، قَالَ: «هُوَ حَسْبُكِ مِنَ النَّارِ».

عەبدوڵڵای کوڕی شەددادی کوڕی هاد دەڵێت: چووینە لای عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ژوورەوە بۆلام لە دەستمدا هەندێك بازنی بینی لە زیو، فەرمووی: «ئەی عائیشە ئەمە چییە؟»، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دروستم کردووە خۆمی پێ دەڕازێنمەوە بۆ تۆ، فەرمووی: «ئایا زەکاتی ئەمە دەدەیت؟»، گوتم: نەخێر، یان ئەگەر خوا ویستی لێ بێت، فەرمووی: «ئەوەندەت بەسە بۆ ئاگر».

٢٧١. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَدْ عَفَوْتُ عَنِ الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، فَهَاتُوا صَدَقَةَ الرِّقَةِ، مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا دِرْهَمًا، وَلَيْسَ فِي تِسْعِينَ وَمِائَةٍ شَيْءٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ مِائَتَيْنِ، فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ».

عەلی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(لە زەکاتی) ئەسپ و کۆیلە چاوپۆشیم کردووە، بۆیە لە هەر چل دەرهەمی زیو دەرهەمێك زەکات بدەن، (بزانن) ئەگەر سەد و نەوەد (دەرهەمیش) بێت، زەکاتی تێدا نییە، جا هەر کاتێك گەیشتە دوو سەد (دەرهەم)، ئەوە پێنج دەرهەمی زەکاتە».

٢٧٢. عَنْ مُعَاذٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا وَجَّهَهُ إِلَى الْيَمَنِ أَمَرَهُ أَنْ يَأْخُذَ مِنَ الْبَقَرِ مِنْ

كُلِّ ثَلَاثِينَ تَبِيعًا، أَوْ تَبِيعَةً، وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً، وَمِنْ كُلِّ حَالِمٍ - يَعْنِي مُحْتَلِمًا - دِينَارًا، أَوْ عَدْلَهُ مِنَ المَعَافِرِ - ثِيَابٌ تَكُونُ بِالْيَمَنِ -.

موعاز ﵁ دەگێڕێتەوە: کاتێك پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ یەمەن فەرمانی پێ کرد کە لە مانگادا، لە سێ مانگا گوێلکێك وەربگرێت ساڵێکی تەواو کردبێت، نێر بێت یان مێ بێت، لە چلدا گوێلکێك کە دوو ساڵی تەواو کردبێت، لە کۆیلە یان ئەوانەی کە جزیە دەدەن (مەبەست لەوانەی کە جزیە دەدەن ئەهلی کتابن) ساڵانە دینارێکیان لێ وەردەگیرێت، (یان ئەگەر پارەش نەبوو بایی ئەو دینارە ساڵی یەك مسقاڵ ئاڵتوون دەدەن و لێیان وەردەگیرێت)، ئەگەر ئەوەش نەبوو ئەوە پۆشاکێکی یەمەنییە بایی دینارێك لێیان دەسەنێت و پۆشاکیان لێ وەردەگرێت.

تێبینی:

(المَعافِر): هۆزێکی یەمەنین، جۆرە قوماشێك هەبووە بە ناوی ئەوانەوە ناو نراوە.

## بَابُ الرَّجُلِ يَبْتَاعُ صَدَقَتَهُ

### باسی ئەو پیاوەی شتێکی کردۆتە خێر و دوایی دەیکڕێتەوە

٢٧٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ ﵁ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَوَجَدَهُ يُبَاعُ، فَأَرَادَ أَنْ يَبْتَاعَهُ، فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: «لَا تَبْتَعْهُ، وَلَا تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ لەپێناوی خوادا بێ بەرامبەر ئەسپێکی بەخشیبوو، بینیی دەفرۆشرێتەوە (خاوەنەکەی دەیەوێت بیفرۆشێتەوە و ئیمام عومەریش دیتوویەتی)، بۆیە عومەر ویستی (بۆخۆی)

بیکرێتەوە، ئیدی لەو بارەوە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەویش فەرمووی: «مەیکڕە و لە چاکەکردنەکەت پەشیمان مەبەوە (وەکوو بلێی کڕینەوەی ئەو شتەی دەیبەخشیت جۆرێکە لە پەشیمانبوونەوە)».

## بَابُ صَدَقَةِ الرَّقِيقِ

### باسی زەکاتی کۆیلە

٢٧٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ فِي الْخَيْلِ وَالرَّقِيقِ زَكَاةٌ، إِلَّا زَكَاةُ الْفِطْرِ فِي الرَّقِيقِ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ئەسپی سواری و کۆیلە زەکاتیان تێدا نییە، تەنها ئەوە نەبێت کۆیلە زەکاتی سەرفیترەی لەسەرە (خاوەنەکەی سەرفیترەی ڕەمەزانی بۆ دەدات)».

٢٧٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِي عَبْدِهِ، وَلَا فِي فَرَسِهِ صَدَقَةٌ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «موسوڵمان زەکاتی ئەسپ و کۆیلەی لەسەر نییە».

## بَابُ صَدَقَةِ الزَّرْعِ

### باسی زەکاتی کشتوکاڵ

٢٧٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فِيمَا سَقَتِ السَّمَاءُ وَالْأَنْهَارُ

وَالْعُيُونُ، أَوْ كَانَ بَعْلاً الْعُشْرُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالسَّوَانِي، أَوِ النَّضْحِ نِصْفُ الْعُشْرِ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەو دانەوێڵەیەی کە بە ئاوی باران و ڕووبار و کانییەکان ئاو بدرێت (واتە: خەرجی تێدا نەکرێت)، یاخود باران ئاوی بدات، یاخود ئەو دارانەی لە ژێرەوە لە ڕەگەکانەوە ئاو لە زەوییەوە هەڵدەمژن بەبێ ئەوەی کە ئاویان بدەیت، ئەمانە هەمووی زەکاتەکەیان لە دە یەکە (یەك لەسەر دەیە، دەیەکە)، ئەوەشی کە بە ئاژەڵ و حوشتر ئاو دەدرێت، ئەوە زەکاتەکە نیوەی دەیەکە، (واتە: بیستیەکە)».

٢٧٧. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «فِيمَا سَقَتِ الْأَنْهَارُ وَالْعُيُونُ الْعُشْرُ، وَمَا سُقِيَ بِالسَّوَانِي فَفِيهِ نِصْفُ الْعُشْرِ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەو دانەوێڵە و زەرعاتانەی کە بە ئاوی ڕووبار و کانی ئاو دەدرێن ئەوە زەکاتەکەی لە دەدا یەکە (یەك لەسەر دەیە، دەیەکە)، ئەوەی کە بە ئاژەڵ و بە حوشتر ئاو دەدرێت (یان لەم سەردەمەدا بە ماتۆڕ و بە ئاو ڕاکێشان و بەم جۆرە شتانە) ئەگەر مەسرەفی تێدا بکرێت ئەوە لە بیستدا یەکە (یەك لەسەر بیست)».

## بَابُ زَكَاةِ الْفِطْرِ

### باسی زەکاتی سەرفیترە

٢٧٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَضَ قَالَ فِيهِ - فِيمَا قَرَأَهُ عَلَيَّ مَالِكٌ -: زَكَاةُ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ صَاعٌ مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعٌ مِنْ شَعِيرٍ عَلَى كُلِّ حُرٍّ، أَوْ عَبْدٍ ذَكَرٍ، أَوْ أُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفیترەی فەڕز کرد، ڕاوییەکە دەڵێت: (پێشەوا) مالیك بۆی خوێندمەوە بەم شێوازە بووە: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەرفیترەی فەڕز کردووە لە ڕەمەزاندا صاعێك لە خورما (صاعێك دوو کیلۆ و چل گرام، دوو کیلۆ و نیو بدرێت باشترە)، یاخود صاعێك لە جۆ (لە ڕیوایەتی دیکە خورما و مێوژ و کەشك هاتوون، هەر شتێك کە قوتی موسوڵمانان بێت و خواردنی ئەو سەردەمە بێت، خواردنی سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر ئەمانە بووە)، لەسەر هەموو کەسێك ئازاد بێت یان کۆیلەش بێت (ئەگەر خۆی پارەی نەبوو، دەبێت گەورەکەی بۆی دەربکات)، نێر بێت، یان مێ بێت لە موسوڵمانان (لەسەر هەموویان فەڕزە).

٢٧٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ فَرَضَ صَدَقَةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ تَمْرٍ، عَلَى الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، وَالْحُرِّ وَالْمَمْلُوكِ.



عەبدوڵڵا ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: زەکاتی سەرفیترەی فەڕز کردووە صاعێك لە جۆ، یان لە خورما، لەسەر بچووك و گەورە، لەسەر ئازاد و کۆیلە.

٢٨٠. عَنْ نَافِعٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﵁: فَعَدَلَ النَّاسُ بَعْدُ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ، قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُعْطِي التَّمْرَ فَأُعْوِزَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ التَّمْرَ عَامًا فَأَعْطَى الشَّعِيرَ.

نافیع دەڵێت: عەبدوڵڵا ﵁ گوتی: خەڵکی لەدوای ئەوە کردیانە نیو صاع لە گەنم، (چونکە گەنم باشتر بووە لە جۆ، ئەوەش موعاویە و ئەوان کردیان)، گوتی: عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش خورمای دەدا، خەڵکی مەدینە ساڵێك پێویستییان بە خورما بوو، ئەو جۆی داوە.

## بَابُ مَنْ يَجُوزُ لَهُ أَخْذُ الصَّدَقَةِ وَهُوَ غَنِيٌّ

## باسی کەسێك دەوڵەمەند بێت و بۆی دروست بێت زەکات وەربگرێت

٢٨١. عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ إِلَّا لِخَمْسَةٍ: لِغَازٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، أَوْ لِعَامِلٍ عَلَيْهَا، أَوْ لِغَارِمٍ، أَوْ لِرَجُلٍ اشْتَرَاهَا بِمَالِهِ، أَوْ لِرَجُلٍ كَانَ لَهُ جَارٌ مِسْكِينٌ فَتُصُدِّقَ عَلَى الْمِسْكِينِ، فَأَهْدَاهَا الْمِسْكِينُ لِلْغَنِيِّ».

عەتائی کوڕی یەسار رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زەکات حەڵاڵ نییە بۆ دەوڵەمەند جگە لە پێنج کەس: بۆ کەسێك غەزا بکات لە پێناوی خوا، بۆ فەرمانبەری کۆکەرەوەی زەکات، یان کەسێك قەرزدارە (بەهۆی ئەوەی کە چاکسازی دەکات لە نێوان دوو کۆمەڵدا، بۆ ئەوەی فیتنەیەك بکوژێنێتەوە، ئەمیش پێی دەدەیت بۆ کوژاندنەوەی فیتنە و ئەو شەڕە)، یان کەسێك صەدەقەیەك هەیە بە پارەی خۆی لە هەژارەکە دەیکڕێت، یان پیاوێك هاوسێیەکی هەژاری هەیە خێر بە هەژارەکە دەکرێت، هەژارەکەش بە دیاری دەیداتە هاوسێ دەوڵەمەندەکەی».

## بَابُ كَمْ يُعْطَى الرَّجُلُ الْوَاحِدُ مِنَ الزَّكَاةِ

## باسی ئەندازەی ئەو زەکاتەی دەدرێت بە یەك کەس

٢٨٢. عَنْ بُشَيْرِ بْنِ يَسَارٍ رضي الله عنه: زَعَمَ أَنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ يُقَالُ لَهُ: سَهْلُ بْنُ أَبِي حَثْمَةَ، أَخْبَرَهُ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَدَاهُ بِمِائَةٍ مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ - يَعْنِي - دِيَةَ الْأَنْصَارِيِّ الَّذِي قُتِلَ بِخَيْبَرَ.

بەشیری کوڕی یەسار دەگێڕێتەوە: کابرایەکی ئەنصاڕی کە ناوی سەهلی کوڕی

ئەبو حەسمەیە پێی ڕاگەیاندووە: پێغەمبەر ﷺ سەد حوشتری پێ داوە (لە حوشتری زەکات) وەکوو خوێنی ئەو ئەنصارییەی کە لە خەیبەردا کوژراوە.

## بَابُ كَرَاهِيَةِ الْمَسْأَلَةِ

## باسی ناپەسندی داواکردن

٢٨٣. عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ - قَالَ: وَكَانَ ثَوْبَانُ مَوْلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ - قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ يَكْفُلُ لِي أَنْ لَا يَسْأَلَ النَّاسَ شَيْئًا، وَأَتَكَفَّلُ لَهُ بِالْجَنَّةِ؟»، فَقَالَ ثَوْبَانُ: أَنَا، فَكَانَ لَا يَسْأَلُ أَحَدًا شَيْئًا.

سەوبان ﷺ - (ڕاوی) دەڵێت: سەوبان کە خزمەتکاری پێغەمبەری خوا ﷺ بووە-، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کێ زەمانەتی ئەوەم بۆ دەکات کە داوای هیچ شتێك لە خەڵکی نەکات، من زەمانی بەهەشتی بۆ دەکەم؟»، سەوبان ﷺ گوتی: من ئەی پێغەمبەر ﷺ (تا دەمرم داوای هیچ شتێك لە خەڵکی ناکەم)، بۆیە (تا مرد) داوای هیچ شتێکی لە خەڵکی نەدەکرد.



## بَابُ عَطِيَّةِ مَنْ سَأَلَ بِاللَّهِ

## باسی پێدان (ی یارمەتی) لەبەر خاتری ناوی خوا

٢٨٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اسْتَعَاذَ بِاللَّهِ فَأَعِيذُوهُ، وَمَنْ سَأَلَ بِاللَّهِ فَأَعْطُوهُ، وَمَنْ دَعَاكُمْ فَأَجِيبُوهُ، وَمَنْ صَنَعَ إِلَيْكُمْ مَعْرُوفًا فَكَافِئُوهُ، فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا مَا تُكَافِئُونَهُ، فَادْعُوا لَهُ حَتَّى تَرَوْا أَنَّكُمْ قَدْ كَافَأْتُمُوهُ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك پەنای پێ گرتن بە خوا، پەنای بدەن، هەر کەسێکیش گوتی: لەبەر خوا ئەو شتەم پێ ببەخشە، پێی ببەخشە، هەر کەسێك داوەتی کردن، وەڵامی بدەنەوە، هەر کەسێك چاکەی لەگەڵدا کردن، پاداشتی بدەنەوە بە چاکە، ئەگەر نەتانبوو پاداشتی بدەنەوە وەکوو خۆی، دوعای بۆ بکەن، تا وا دەبینن پاداشتان داوەتەوە».

## بَابُ أَجْرِ الْخَازِنِ

### باسی پاداشتی ئەو کەسەی لەسەر خەزێنە و بەیتولمالی موسوڵمانانە

٢٨٥. عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الْخَازِنَ الْأَمِينَ الَّذِي يُعْطِي مَا أُمِرَ بِهِ كَامِلًا مُوَفَّرًا، طَيِّبَةً بِهِ نَفْسُهُ، حَتَّى يَدْفَعَهُ إِلَى الَّذِي أُمِرَ لَهُ بِهِ أَحَدُ الْمُتَصَدِّقَيْنِ».

ئەبو مووسا رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەوەی لەسەر بەیتولماله (و فەرمانبەری دەوڵەتە)، بەڵام موسوڵمانە و ئەمینە و چۆنی فەرمان پێ کراوە، بەم شێوازە هەمووی دەبەخشێت، هیچی لێ کەم ناکاتەوە و لە دڵی دەردەچێت و ڕەزیلی ناکات، بۆڵەبۆڵ ناکات بەسەریدا تا دەیداتە ئەو کەسەی کە فەرمان کراوە بیداتە دەستی، ئەمیش یەکێکە لەو کەسانەی کە وەك ئەوە وایە خێری کردبێت».

## بَابٌ فِي صِلَةِ الرَّحِمِ

### باسێك دەربارەی پەیوەندیی خزمایەتی

٢٨٦. عَنِ الْحَسَنِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ الْوَاصِلُ بِالْمُكَافِئِ، وَلَكِنْ هُوَ

الَّذِي إِذَا قُطِعَتْ رَحِمُهُ وَصَلَهَا».

حەسەن ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتی بە بەرانبەر نییە (ئەو هات تۆش بچیت بۆ لای)، بەڵام ئەوەیە ئەگەر کەسێك سەردانی نەکرا، ئەو سەردانی بکات».

## بَابٌ فِي الشُّحِّ

### باسێك دەربارەی چرووکی

٢٨٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵁ قَالَ: خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالشُّحَّ، فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِالشُّحِّ، أَمَرَهُمْ بِالْبُخْلِ فَبَخِلُوا، وَأَمَرَهُمْ بِالْقَطِيعَةِ فَقَطَعُوا، وَأَمَرَهُمْ بِالْفُجُورِ فَفَجَرُوا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دا و فەرمووی: «(ئەی خەڵکینە) ئاگادارتان دەکەمەوە لە چرووکی، ئوممەتانی پێش ئێوە بەهۆی ڕەزیلی لەناو چوون، ئەم ڕەزیلییە فەرمانی پێ کردن بە ڕەزیلی و چرووکی ئەمانیش ڕەزیل بوون، فەرمانی پێ کردن بە پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتی پچڕاندیان، فەرمانی پێ کردن بە خراپی و خراپەیان کرد (یان گوتراوە: بە درۆ، واتە: درۆیان کرد)».

٢٨٨. عن أَسْمَاءِ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا لِي شَيْءٌ إِلَّا مَا أَدْخَلَ عَلَيَّ الزُّبَيْرُ بَيْتَهُ، أَفَأُعْطِي مِنْهُ؟ قَالَ: «أَعْطِي، وَلَا تُوكِي، فَيُوكَى عَلَيْكِ».

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من هیچ شتێکی خۆمم نییە بۆ بەخشین جگە لەو شتە نەبێت کە زوبەیر بۆم دێنێتەوە ماڵەوە، ئایا لەو

ماڵە ببەخشم؟ فەرمووی: «لێی ببەخشە و لە کیسە و توورەکەی مەکە و سەرەکەی ببەستیت، چونکە خواش لە تۆی دەگرێتەوە».

تێبینی:

(الإیکاء): واتە: دەستگرتنەوە و دەستنوقاندن و نەبەخشین.

# كِتَابُ اللُّقْطَةِ

## پەرتووکی شتی دۆزراوە

٢٨٩. عَنْ سُوَيْدِ بْنِ غَفَلَةَ قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ زَيْدِ بْنِ صُوحَانَ، وَسَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ فَوَجَدْتُ سَوْطًا، فَقَالَا: لِيَ اطْرَحْهُ، فَقُلْتُ: لَا، وَلَكِنْ إِنْ وَجَدْتُ صَاحِبَهُ وَإِلَّا اسْتَمْتَعْتُ بِهِ، فَحَجَجْتُ، فَمَرَرْتُ عَلَى الْمَدِينَةِ فَسَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ ﵁ فَقَالَ: وَجَدْتُ صُرَّةً فِيهَا مِائَةُ دِينَارٍ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «عَرِّفْهَا حَوْلًا»، فَعَرَّفْتُهَا حَوْلًا، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَقَالَ: «عَرِّفْهَا حَوْلًا»، فَعَرَّفْتُهَا حَوْلًا، ثُمَّ أَتَيْتُهُ، فَقَالَ: «عَرِّفْهَا حَوْلًا»، فَعَرَّفْتُهَا حَوْلًا، ثُمَّ أَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: لَمْ أَجِدْ مَنْ يَعْرِفُهَا فَقَالَ: «احْفَظْ عَدَدَهَا وَوِكَاءَهَا وَوِعَاءَهَا، فَإِنْ جَاءَ صَاحِبُهَا وَإِلَّا فَاسْتَمْتِعْ بِهَا»، وَقَالَ: وَلَا أَدْرِي أَثَلَاثًا قَالَ: «عَرِّفْهَا»، أَوْ مَرَّةً وَاحِدَةً.

سوەیدی کوڕی غەفەلە دەڵێت: غەزام کرد لەگەڵ زەیدی کوڕی صوحان و سەلمانی کوڕی ڕەبیعە قامچییەکم دۆزیەوە، پێیان گوتم: فڕێی بدە، گوتم: نەخێر، بەڵام ئەگەر خاوەنەکەیم دۆزیەوە دەیدەمەوە، ئەگەرنا بۆ خۆم سوودی لێ دەبینم، دەڵێت: حەجم کرد بە مەدینەدا تێپەڕیم، پرسیارم لە ئوبەی کوڕی کەعب ﵁ کرد، گوتی: توورەکەیەکم دۆزیەوە کە سەد دیناری تێدا بوو، هاتم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ساڵێك بیناسێنە و بەدوای خاوەنیدا بگەڕێ، دەڵێت: منیش ساڵێك

بەدوای خاوەنیدا گەڕام، پاشان هاتمەوە (ڕیوایەتی دیکە هاتووە: دەڵێت: خاوەنیم نەدۆزیەوە)، فەرمووی: ساڵێکی دیکەش بەدوای خاوەنیدا بگەڕێ، ساڵێکی دیکەش بەدوای خاوەنیدا گەڕام، پاشان هاتمەوە، فەرمووی: ساڵێکی دیکەش بەدوای خاوەنیدا بگەڕێ، پاشان هاتم گوتم: کەسم نەدۆزیەوە خاوەنی بێت، فەرمووی: ژمارەکەی چەندە لای خۆت بیپارێزە، ئەو شتەی کە تێدایەتی (ئەو توورەکەیە)، وە ئەو پەتەی کە پێی بەستراوە، ئەگەر هەر کاتێك خاوەنی هاتەوە بیدەرەوە، ئەگەرنا بۆ خۆت سوودی لێ ببینە، بەڵام نازانم فەرمووی: سێ ساڵ بەدوای خاوەنیدا بگەڕێ، یاخود یەك ساڵ.

٢٩٠. عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّهُ الْتَقَطَ دِينَارًا فَاشْتَرَى بِهِ دَقِيقًا، فَعَرَفَهُ صَاحِبُ الدَّقِيقِ فَرَدَّ عَلَيْهِ الدِّينَارَ فَأَخَذَهُ عَلِيٌّ وَقَطَعَ مِنْهُ قِيرَاطَيْنِ فَاشْتَرَى بِهِ لَحْمًا.



عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە: کە دینارێکی دۆزیەوە چوو ئاردی پێ کڕی، خاوەن ئاردەکە (پێشەوا عەلیی) ناسی، دینارەکەی بۆ گەڕاندەوە، عەلیش وەریگرت و کردیە دوو بەشەوە، بە بەشێکیان گۆشتی کڕی (واتە: پارەکەی ورد کردەوە).

# كِتَاب الْمَنَاسِكِ

## پەرتووكی ڕێوڕەسمی حەج

### بَابُ فَرْضِ الْحَجِّ

### باسی فەڕزبوونی حەج

٢٩١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ، سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، الْحَجُّ فِي كُلِّ سَنَةٍ أَوْ مَرَّةً وَاحِدَةً قَالَ: «بَلْ مَرَّةً وَاحِدَةً، فَمَنْ زَادَ فَهُوَ تَطَوُّعٌ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: ئەقرەعی کوڕی حابیس رضي الله عنه پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا هەموو ساڵێك فەڕزە لەسەرمان حەج بکەین، یاخود لە تەمەندا جارێکە؟ فەرمووی: «بەڵکوو لە هەموو تەمەندا یەك جارە، هەر کەسێك زیاتر بکات ئەوە سوننەتە و خێری زیادەی کردووە».

٢٩٢. عَنِ ابْنٍ لِأَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ لِأَزْوَاجِهِ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ: «هَذِهِ ثُمَّ ظُهُورَ الْحُصْرِ».

کوڕێکی ئەبو واقیدی لەیسی، لە باوکییەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: گوێم لێ

بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجیماڵئاوایی بە خێزانەکانی دەفەرموو: «ئەمە حەجە فەڕزەکە بوو کە کردتان، پاشان (پاش ئەو حەجەی کە کردتان) ئیدی لە ماڵەوە بمێننەوە».

## بَابٌ فِي الْمَرْأَةِ تَحُجُّ بِغَيْرِ مَحْرَمٍ

### باسێك دەربارەی ئافرەت بەبێ مەحرەم حەج بكات

٢٩٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ مُسْلِمَةٍ تُسَافِرُ مَسِيرَةَ لَيْلَةٍ، إِلَّا وَمَعَهَا رَجُلٌ ذُو حُرْمَةٍ مِنْهَا».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «حەڵاڵ نییە بۆ ئافرەتی موسوڵمان سەفەر بکات ماوەی یەك شەو (ڕێگا و دووریەکەی شەوێك بێت)، مەگەر پیاوێکی مەحرەمی لەگەڵدا بێت».

٢٩٤. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَحِلُّ لِامْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ تُسَافِرَ سَفَرًا فَوْقَ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فَصَاعِدًا، إِلَّا وَمَعَهَا أَبُوهَا أَوْ أَخُوهَا أَوْ زَوْجُهَا أَوِ ابْنُهَا أَوْ ذُو مَحْرَمٍ مِنْهَا».

ئەبو سەعید رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «حەڵاڵ نییە بۆ ئافرەتێك بڕوای بە خوا و بەڕۆژی دوایی هەبێت، سەفەرێك بکات لە سەرووی سێ ڕۆژەوە (نەك سێ ڕۆژ بمێنێتەوە، بەڵکوو بە سێ ڕۆژ بگاتە ئەو شوێنە) یان زیاتر بێت، مەگەر باوکی، یان برای، یان مێردی، یان کوڕی، یان مەحرەمێکی لەگەڵدا بێت».

## بَابُ التِّجَارَةِ فِي الْحَجِّ

## باسی بازرگانیکردن له کاتی حەج

٢٩٥. عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ: {لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلاً مِنْ رَبِّكُمْ} البقرة: ١٩٨، قَالَ: كَانُوا لَا يَتَّجِرُونَ بِمِنًى، فَأُمِرُوا بِالتِّجَارَةِ إِذَا أَفَاضُوا مِنْ عَرَفَاتٍ.

موجاهید له عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە ﵄ دەگێڕێتەوە، دەڵێت: ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلاً مِنْ رَبِّكُمْ}، واتە: هیچ گوناهبار نابن ئەگەر له کاتی حەجدا له فەزڵی پەروەردگارتان خۆتان بەهرەوەر بکەن (وەك بازرگانی و شت کڕین). گوتی: هاوەڵان بازرگانییان نەدەکرد له مینا (له کاتی حەج)، پاشان مۆڵەتیان پێ درا بە بازرگانیکردن دوای ئەوەی له کێوی عەرەفات هاتنه خوارەوە.

تێبینی:

پێش ئەوەی ئەم ئایەتە دابەزێت موسوڵمانان وایان دەزانی له کاتی حەجکردندا بازرگانیکردن و کڕین و فرۆشتن ڕێگەپێدراو نییە، بەڵام کاتێك ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی، موسوڵمانان دڵنیا بوونەوە کە دوای تەواوکردنی فەریزەی عەرەفات، موسوڵمان حەجەکەی تەواو کردووە و بەری دەکەوێت، بۆیە لەدوای عەرەفات بازرگانیکردن و کڕین و فرۆشتن ئاساییە و ڕێگەپێدراوە.

## بَابٌ فِي الصَّبِيِّ يَحُجُّ

## باسێك دەربارەی حەجکردنی منداڵ

٢٩٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالرَّوْحَاءِ فَلَقِيَ رَكْبًا فَسَلَّمَ

عَلَيْهِمْ، قَالَ: «مَنِ الْقَوْمُ؟»، فَقَالُوا: الْمُسْلِمُونَ، فَقَالُوا: فَمَنْ أَنْتُمْ؟، قَالُوا: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَفَزِعَتِ امْرَأَةٌ فَأَخَذَتْ بِعَضُدِ صَبِيٍّ فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ مِحَفَّتِهَا، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ لِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: «نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕەوحاء بوو، لەوێ بە کاروانێك گەیشت و سەلامی لێ کردن، فەرمووی: «ئێوە کێن؟»، گوتیان: موسوڵمانین، ئینجا گوتیان: ئەی ئێوە کێن؟ (هاوەڵان) گوتیان: پێغەمبەری خوایە ﷺ، لەو کاتەدا ئافرەتێك ڕاچڵەکی و قۆڵی منداڵێکی گرت و لە کەژاوەکەی خۆی دەریهێنا و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ئەو (منداڵ)ە حەجی بەر دەکەوێت؟ فەرمووی: «بەڵێ، تۆش پاداشتت دەدرێتەوە».

## بَابٌ فِي الْمَوَاقِيتِ

### باسێك دەربارەی میقاتەکان (شوێنەکانی ئیحرامبەستن)

٢٩٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ وَلِأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ وَلِأَهْلِ نَجْدٍ قَرْنَ وَبَلَغَنِي أَنَّهُ وَقَّتَ لِأَهْلِ الْيَمَنِ يَلَمْلَمَ.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ میقاتی خەڵکی مەدینەی دیاری کرد کە زولحولەیفەیە[١]، وە بۆ خەڵکی شامیش جوحفەی دیاری کرد[٢]، بۆ خەڵکی نەجدیش قەڕنی دیاری کرد[٣]، وە پێم گەیشتووە بۆ خەڵکی یەمەنیش یەلەملەمی دیاری کردووە[٤].

(١) شوێنێکە (١٩٨) سەد و نەوەد و هەشت میل لە مەککەوە دوورە، (٦) شەش میل لە مەدینەوە دوورە، نزیکەی (١١) یانزە کیلۆمەتر دەکات.
(٢) شوێنێکە نزیکەی (٨٢) هەشتا و دوو میل لە مەککەوە دوورە.
(٣) شاخێکە لە ڕۆژهەڵاتەوە نزیکەی (٣٠) سی میل لە مەککەوە دوورە.
(٤) لەوێوە ئیحرام دەبەستن، کە ئەویش (٣٠) سی میل لە مەککەوە دوورە.

## بَابُ الطِّيبِ عِنْدَ الْإِحْرَامِ

باسی بۆن لە خۆدان لە کاتی ئیحرامدا

٢٩٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِإِحْرَامِهِ، قَبْلَ أَنْ يُحْرِمَ، وَلِإِحْلَالِهِ قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: من بۆخۆم پێش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرام دابەستێت بۆ ئیحرامەکەی، بۆنی خۆشم لێ دەدا (لە پێغەمبەر ﷺ)، هەروەها کاتێکیش کە ئیحرامی دەشکاند، پێش ئەوەی تەوافی ماڵی خوا بکات.

## بَابٌ فِي هَدْيِ الْبَقَرِ

باسێك دەربارەی مانگای قوربانی (ڕەشەوڵاخ: مانگا، گا، گامێش)

٢٩٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَحَرَ عَنْ آلِ مُحَمَّدٍ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بَقَرَةً وَاحِدَةً.

عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاوایی لەجیاتی بنەماڵە و خانەوادەکەی خۆی یەك مانگای سەر بڕی.

## بَابٌ فِي الْإِقْرَانِ

باسێك دەربارەی ئەنجامدانی حەج و عومرە بەیەکەوە

٣٠٠. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُلَبِّي بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ

جَمِيعًا، يَقُولُ: «لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا، لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا».

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ تەلبیەی دەکرد، ئیحرامی دەبەست بەحەج و عومڕە، دەیفەرموو: «(لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا، لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا)، (بەم شێوازە تەلبیەی دەکرد)».

## بَابُ الرَّجُلِ يَحُجُّ عَنْ غَيْرِهِ

### باسی کەسێك حەج لەبری کەسێکی دیکە بکات

٣٠١. عَنْ رَجُلٍ مِنْ بَنِي عَامِرٍ ﵁ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أَبِي شَيْخٌ كَبِيرٌ لَا يَسْتَطِيعُ الْحَجَّ وَلَا الْعُمْرَةَ وَلَا الظَّعْنَ، قَالَ: «احْجُجْ عَنْ أَبِيكَ وَاعْتَمِرْ».

پیاوێك لە بەنو عامیر ﵁ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، باوکم پیاوێکی بەتەمەنە ناتوانێت حەج بکات، ناتوانێت عومڕە بکات، ناتوانێت سواری وڵاخ بێت و بڕوات (لەبەر گەورەیی و چوونە نێو ساڵی)، فەرمووی: «بڕۆ لەجیاتی باوکت حەج و عومڕەش بکە».

## بَابٌ فِي تَقْبِيلِ الْحَجَرِ

### باسی ماچکردنی بەردە ڕەشەکە

٣٠٢. عَنْ عُمَرَ ﵁: أَنَّهُ جَاءَ إِلَى الْحَجَرِ فَقَبَّلَهُ، فَقَالَ: إِنِّي أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ لَا تَنْفَعُ وَلَا تَضُرُّ وَلَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُقَبِّلُكَ مَا قَبَّلْتُكَ.

عومەر ﵁ هات بەردە ڕەشەکەی ماچ کرد، گوتی: من دەزانم تۆ بەردی نە

سوودبەخشی و نە زیانبەخش، ئەگەر پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیایە ماچت دەکات، منیش ماچم نەدەکردی.

## بَابُ الدُّعَاءِ فِي الطَّوَافِ

## باسی پاڕانەوە لە تەوافدا

٣٠٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ مَا بَيْنَ الرُّكْنَيْنِ: «رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الْآخِرَةِ حَسَنَةً، وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ».

عەبدوڵڵای کوڕی سائیب رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە نێوان هەردوو ڕوکنەکەدا (بەردە ڕەشەکە و ڕوکنی یەمانی) دەیفەرموو: «خوایە لە دونیا چاکەمان پێ ببەخشە، لە ڕۆژی دواییشدا هەر چاکەمان پێ ببەخشە، لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە».

## بَابُ الْوُقُوفِ بِعَرَفَةَ

## باسی ڕاوەستان لە عەرەفە

٣٠٤. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَتْ قُرَيْشٌ وَمَنْ دَانَ دِينَهَا يَقِفُونَ بِالْمُزْدَلِفَةِ وَكَانُوا يُسَمَّوْنَ الْحُمْسَ وَكَانَ سَائِرُ الْعَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَةَ قَالَتْ: فَلَمَّا جَاءَ الْإِسْلَامُ أَمَرَ اللَّهُ تَعَالَى نَبِيَّهُ ﷺ أَنْ يَأْتِيَ عَرَفَاتٍ فَيَقِفَ بِهَا، ثُمَّ يُفِيضَ مِنْهَا فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى: {ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ} البقرة: ١٩٩.

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: قوڕەیش و ئەوانەی لەسەر ئایینی قوڕەیش بوون (پێش هاتنی ئیسلام) لە موزدەلیفە ڕادەوەستان (لەجیاتی عەڕەفات)، هەروەها ناو دەبران بە

(الْحُمُس)، تەواوی عەرەبەکانی دیکەش لە عەرەفە ڕادەوەستان، گوتی: جا کاتێك ئیسلام هات، خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کرد کە بێتە عەرەفە و لەوێ بوەستێت، پاشان لەوێوە بێتەوە خوارێ (بۆ موزدەلیفە)، ئا ئەوە مانای فەرماییشتی خوایە کە دەفەرموێت: {ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ}.

## بَابُ يَبِيتُ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى

### باسی کەسێك شەوانی مینا لە مەککە بمێنێتەوە (ئایا دروستە؟)

٣٠٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: اسْتَأْذَنَ الْعَبَّاسُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِيَ مِنًى مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ، فَأَذِنَ لَهُ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: عەبباس رضي الله عنه داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، کە شەوانی مینا بچێت لە مەککە بمێنێتەوە بۆ ئەوەی ئاو بە خەڵکی بدات، ئەویش مۆڵەتی پێ دا.

## بَابُ فِي رَمْيِ الْجِمَارِ

### باسێك دەربارەی ڕەجمکردنی شەیتان

٣٠٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ كَانَ يَأْتِي الْجِمَارَ فِي الْأَيَّامِ الثَّلَاثَةِ بَعْدَ يَوْمِ النَّحْرِ مَاشِيًا ذَاهِبًا وَرَاجِعًا، وَيُخْبِرُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەهات بۆ ڕەمی جەمەڕات لە سێ ڕۆژەکەی دوای ڕۆژی جەژندا (أيام التشريق) بەپێ دەهات و بەپێ دەگەڕایەوە، دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ وای کردووە.

٣٠٧. عن جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ يَقُولُ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَرْمِي عَلَى رَاحِلَتِهِ يَوْمَ النَّحْرِ يَقُولُ: «لِتَأْخُذُوا مَنَاسِكَكُمْ، فَإِنِّي لَا أَدْرِي لَعَلِّي لَا أَحُجُّ بَعْدَ حَجَّتِي هَذِهِ».

جابری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە ڕۆژی جەژندا ڕەمی جەمەڕاتی دەکرد لەسەر حوشترەکەی، دەیفەرموو: «بۆئەوەی کە دروشمەکانی حەجکردنتان لە من وەربگرن، چونکە نازانم لەوانەیە لەدوای ئەم حەجەوە حەجی دیکە نەکەم (ئەمە وەکوو ئاماژەیەکە، هەر بۆیە پێی گوتراوە: حەجیماڵئاوایی، پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵئاوایی لە خەڵکی کرد)».

## بَابُ الْحَلْقِ وَالتَّقْصِيرِ

### باسی سەرتاشین و کورتکردنەوەی

٣٠٨. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَالْمُقَصِّرِينَ؟ قَالَ: «اللَّهُمَّ ارْحَمِ الْمُحَلِّقِينَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَالْمُقَصِّرِينَ؟ قَالَ: «وَالْمُقَصِّرِينَ».

عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوایە ڕەحم بەو کەسانە بکە کە قژیان دەتاشن»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەدی ئەوانەی کە قژیان کورت دەکەنەوە؟ فەرمووی: «خوایە ڕەحم بەو کەسانە بکەیت کە قژیان دەتاشن»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەدی ئەوانەی کە قژیان کورت دەکەنەوە؟ فەرمووی: «ئەوانەشی کە کورتی دەکەنەوە».

## بَابُ الْإِفَاضَةِ فِي الْحَجِّ

### باسی تەوافی ئیفازە لە کاتی حەجدا

٣٠٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حَلَقَ رَأْسَهُ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ.

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا قژی خۆی تاشیوە.

٣١٠. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَفَاضَ يَوْمَ النَّحْرِ ثُمَّ صَلَّى الظُّهْرَ بِمِنًى يَعْنِي رَاجِعًا.

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ تەوافی ئیفازەی کرد لە ڕۆژی جەژندا، پاشان کە گەڕایەوە نوێژی نیوەڕۆی لە مینا کرد.



## بَابُ الْوَدَاعِ

### باسی تەوافی ماڵئاوایی

٣١١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَنْصَرِفُونَ فِي كُلِّ وَجْهٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: خەڵك لەهەموو لایەکەوە دەڕۆیشتن (مەککەیان بەجێ دەهێشت، حەجیان تەواو کرد)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «کەس نەڕوات و بڵاوەی لێ مەکەن با دوا شت کە دەیکەن تەوافی ماڵئاوایی بێت».

## بَابٌ فِي إِتْيَانِ الْمَدِينَةِ

### باسێك دەربارەی سەردانكردنی مەدینە

٣١٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تُشَدُّ الرِّحَالُ إِلَّا إِلَى ثَلَاثَةِ مَسَاجِدَ: مَسْجِدِ الْحَرَامِ، وَمَسْجِدِي هَذَا، وَالْمَسْجِدِ الْأَقْصَى».

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «بارگەوبنە ناپێچرێتەوە (بەنیازی عیبادەت بۆ هیچ شوێنێك)، جگە لە سێ مزگەوت: مزگەوتی حەرام (لە مەككە)، مزگەوتی من (لە مەدینە)، مزگەوتی ئەقصا».

## بَابٌ فِي تَحْرِيمِ الْمَدِينَةِ

### باسێك دەربارەی ئەوەی لە مەدینە حەرامە

٣١٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَأْتِي قُبَاءَ مَاشِيًا وَرَاكِبًا. زَادَ ابْنُ نُمَيْرٍ وَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ.

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتە مزگەوتی قوباء بەپیادە و بەسواری، ئیبن نومەیر ئەوەی بۆ زیاد كردووە، دەڵێت: دوو ڕكات نوێژی دەكرد (لەبەر ئەوەی دوو ڕكات نوێژ لە مزگەوتی قوبائدا خێری عومرەیەكی هەیە).

## بَابُ زِيَارَةِ الْقُبُورِ

### باسی سەردانكردنی گۆڕستان

٣١٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ أَحَدٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إِلَّا رَدَّ اللَّهُ

عَلَيَّ رُوحِي حَتَّى أَرُدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ».

ئەبو هوڕەیڕە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ کەسێك نییە سەلامم لێ بکات (وە صەڵاواتم لەسەر بدات) مەگەر خوا ڕووحم دەخاتەوە بەر تا وەڵامی سەلامەکەی دەدەمەوە».

٣١٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُورًا، وَلَا تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيدًا، وَصَلُّوا عَلَيَّ فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ تَبْلُغُنِي حَيْثُ كُنْتُمْ».

ئەبو هوڕەیڕە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ماڵەکانتان مەکەن بەگۆڕستان، گۆڕی منیش مەکەن بە شوێنی پەرستش و پاڕانەوە، صەڵاواتم لەسەر بدەن، چونکە بێگومان لە هەر شوێنێك بوون صەڵاواتەکانتانم پێ دەگات».

# كِتَابُ النِّكَاحِ

## پەرتووكی هاوسەرگیری

### بَابُ التَّحْرِيضِ عَلَى النِّكَاحِ

### باسی هاندان بۆ هاوسەرگیریکردن

٣١٦. عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: إِنِّي لَأَمْشِي مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁ بِمِنًى إِذْ لَقِيَهُ عُثْمَانُ فَاسْتَخْلَاهُ فَلَمَّا رَأَى عَبْدُ اللَّهِ، أَنْ لَيْسَتْ لَهُ حَاجَةٌ قَالَ لِي: تَعَالَ يَا عَلْقَمَةُ فَجِئْتُ فَقَالَ لَهُ: عُثْمَانُ أَلَا نُزَوِّجُكَ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ بِجَارِيَةٍ بِكْرٍ لَعَلَّهُ يَرْجِعُ إِلَيْكَ مِنْ نَفْسِكَ مَا كُنْتَ تَعْهَدُ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَئِنْ قُلْتَ ذَاكَ لَقَدْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ مِنْكُمْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ».

عەلقەمە دەڵێت: لە میناداا لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوددا ﵁ دەڕۆیشتم، عوسمان ﵁ پێی گەیشت جیای کردەوە، کاتێك عەبدوڵڵا بینیی کە هیچ پێویستی و کارێکی گرنگ نییە، بانگی کردم گوتی: عەلقەمە وەرە (لەوانەیە دوای ئەوەی کە پێشەوا عوسمان قسەکەی لەگەڵ کردبێت بانگی کردبێت)، هاتم، عوسمان پێی گوت:

ئەی باوکی عەبدورڕەحمان، ئایا کچێکت بۆ نەهێنین کە لەوانەیە ئەوەی لە پێشتردا هەتبووە لە گورجوگۆڵی و گەنجی بۆت بگەڕێنێتەوە و لاشەت بژێنێتەوە (گەنجیت بۆ بگەڕێنێتەوە)، عەبدوڵڵا گوتی: کە تۆ هەر ئەم قسەیەت کرد منیش فەرموودەیەکت بۆ دەگێڕمەوە (وەکوو پاڵپشتی بۆ قسەکەی پێشەوا عوسمان ﵁) گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «هەر کەسێك لە ئێوە توانای هەیە با هاوسەرگیری بکات، لەبەر ئەوەی هاوسەرگیری چاو دەپۆشێت و داوێن دەپارێزێت (لە کەوتنە نێو حەرامەوە)، هەر کەسێك توانای ئەوەی نەبوو، با بەڕۆژوو بێت، لەبەر ئەوەی ڕۆژوو بۆ مرۆڤ پارێزەرە».

## بَابُ مَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنْ تَزْوِيجِ ذَاتِ الدِّينِ

### باسی فەرمانکردن بە هاوسەرگیریکردن لەگەڵ کەسی پابەند بە ئیسلام

٣١٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تُنْكَحُ النِّسَاءُ لِأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا، وَلِحَسَبِهَا، وَلِجَمَالِهَا، وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: « ئافرەت لەبەر چوار شت مارە دەکرێت: لەبەر ماڵ و دارایی، لەبەر بنەماڵە و ڕەچەڵەکی، لەبەر جوانیی، لەبەر ئایینی، جا دەست بگرە بە خاوەن ئایینەوە، (ئەگەر وا نەکەیت) دەست کورت دەبیت و هەژار دەکەویت (لە گشت خێر و بێرێکی ئافرەتی چاك)».

## بَابُ يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ النَّسَبِ

### باسی ئەوەی هەرچی بە ڕەچەڵەك حەرام دەبێت، بەهۆی شیرپێدانیشەوە حەرام دەبێت

٣١٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «يَحْرُمُ مِنَ الرَّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الْوِلَادَةِ».

عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەوەی بەهۆی ڕەچەڵەکەوە حەرام دەبێت، بەهۆی شیرخواردنیشەوە حەرام دەبێت، (دەبن بە خوشك و برا و برا و برازا و خاڵ و خوارزا و ... لە شیری)».

## بَابُ هَلْ يُحَرِّمُ مَا دُونَ خَمْسِ رَضَعَاتٍ

### باسی ئەوەی کە ئایا کەمتر لە پێنج جار شیرخواردن دەیکاتە مەحرەم

٣١٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ مِنَ الْقُرْآنِ عَشْرُ رَضَعَاتٍ يُحَرِّمْنَ، ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ، فَتُوُفِّيَ النَّبِيُّ ﷺ وَهُنَّ مِمَّا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: سەرەتا ئایەتێك بووە لە قورئاندا کە خوا ﷻ دایبەزاندووە دەبێت ئافرەتێك دە جار شیر بداتە منداڵێك، ئینجا ئەو ئافرەتە دەبێتە دایکی ئەو منداڵە و لەو منداڵە حەرام دەبێت، دوای ئەوە نەسخ بووەوە بە پێنج جار (پێنج جار شیر بخوات ئیدی دەبێت بە دایکی)، کاتێك پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد ئەمە هەر لە قورئاندا دەخوێندرایەوە.

٣٢٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُحَرِّمُ الْمَصَّةُ وَلَا الْمَصَّتَانِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر منداڵێك مژێك یان دوو مژ (جارێك یان دوو جار) شیری ئافرەتێکی خوارد لێی حەرام نابێت (نابێت بە دایکی)».

## بَابُ مَا يُكْرَهُ أَنْ يُجْمَعَ بَيْنَهُنَّ مِنَ النِّسَاءِ

### باسی ئەو ئافرەتانەی کە نابێت پیاو بەیەکەوە لەژێر نیکاحی خۆیدا کۆیان بکاتەوە

٣٢١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، وَلَا الْعَمَّةُ عَلَى بِنْتِ أَخِيهَا، وَلَا الْمَرْأَةُ عَلَى خَالَتِهَا، وَلَا الْخَالَةُ عَلَى بِنْتِ أُخْتِهَا، وَلَا تُنْكَحُ الْكُبْرَى عَلَى الصُّغْرَى، وَلَا الصُّغْرَى عَلَى الْكُبْرَى».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نابێت ئافرەتێك مارە بکەیت بەسەر پووریدا (خوشکی باوك، واتە: ئافرەتێکت هێناوە پاشان برازاکەی بێنیت بەسەریدا)، نابێت تۆ ئافرەتێکت بهێنیت بەسەر پووریدا (خوشکی باوکی، واتە: لە یەك کاتدا نابێت دوو خێزانت هەبێت یەکێکیان برازا بێت و یەکێکیان خوشکی باوك بێت)، نابێت ئافرەت بێنیت بەسەر پووریدا (خوشکی دایك)، یاخود ئافرەتەکە بێنیت بەسەر خوشکەزادا (لە یەك کاتدا نابێت دوو خێزانت هەبێت یەکێکیان خوشکەزای ئەوەی دیکە بێت، یان برازای ئەوەی دیکە بێت، ئەوەی دیکە پووری بێت)، نابێت گەورە بەسەر بچووکدا مارە بکەیت (گەورە مەبەستی پێی پوورەکانە، خوشکی دایك و خوشکی باوك، وە بچووك مەبەستی پێی برازا و خوشکەزایە)، نابێت بچووك بەسەر گەورەدا مارە بکەیت».

## بَابٌ فِي الشِّغَارِ

### باسێك دەربارەی ژن بە ژن

٣٢٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الشِّغَارِ. زَادَ مُسَدَّد فِي حَدِيثِهِ: قُلْتُ لِنَافِعٍ: مَا الشِّغَارُ قَالَ: يَنْكِحُ ابْنَةَ الرَّجُلِ، وَيُنْكِحُهُ ابْنَتَهُ بِغَيْرِ صَدَاقٍ، وَيَنْكِحُ أُخْتَ الرَّجُلِ، وَيُنْكِحُهُ أُخْتَهُ بِغَيْرِ صَدَاقٍ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری کردووە لە ژن بە ژن، موسەددەد لە فەرموودەکەیدا ئەوەی زیاد کرد: بە نافیعم گوت: ئەرێ شیغار چییە؟ گوتی: ئەم مارەی کچی ئەم پیاوە دەکات، ئەویش مارەی کچەکەی ئەم دەکات (ژن بە ژن دەکەن) بەبێ دانانی مارەیی، خوشکەکەی مارە دەکات ئەمیش خوشکەکەی خۆی پێ دەدات بەبێ دانانی مارەیی.

## بَابٌ فِي التَّحْلِيلِ

### باسێك دەربارەی حەڵاڵکردن

٣٢٣. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَعَنَ اللَّهُ الْمُحَلِّلَ، وَالْمُحَلَّلَ لَهُ».

عەلی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا نەفرەتی کردووە لەو پیاوەی ئافرەت بۆ کەسێکی دیکە حەڵاڵ دەکاتەوە و ئەوەیشی بۆی حەڵاڵ دەکرێتەوە».

## بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ أَنْ يَخْطُبَ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ

### باسێك دەربارەی ناپەسندی داخوازی پیاوێك بەسەر داخوازی براكەیەوە

٣٢٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَخْطُبُ الرَّجُلُ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دروست نییە پیاو بچێتە داخوازی ئافرەتێك كە برا (موسوڵمانەكە)ی لەسەر داخوازییەكەی بێت».

## بَابٌ فِي الرَّجُلِ يَنْظُرُ إِلَى الْمَرْأَةِ وَهُوَ يُرِيدُ تَزْوِيجَهَا

### باسێك دەربارەی كەسێك دەیەوێت ئافرەتێك بخوازێت، دروستە بڕوات سەیری بكات

٣٢٥. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا خَطَبَ أَحَدُكُمُ الْمَرْأَةَ، فَإِنِ اسْتَطَاعَ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى مَا يَدْعُوهُ إِلَى نِكَاحِهَا فَلْيَفْعَلْ»، قَالَ: فَخَطَبْتُ جَارِيَةً فَكُنْتُ أَتَخَبَّأُ لَهَا حَتَّى رَأَيْتُ مِنْهَا مَا دَعَانِي إِلَى نِكَاحِهَا وَتَزَوُّجِهَا فَتَزَوَّجْتُهَا.

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەكێك لە ئێوە چووە داخوازی ئافرەتێك ویستی مارەی بكات، ئەگەر توانی تەماشای بكات با تەماشای بكات، ئەگەر ئەو تەماشاكردنە وات لێ دەكات كە بیخوازی، ئەگەر توانیت بڕۆ سەیری بكە، (جابیر خۆی) دەڵێت: چوومە داخوازی ئافرەتێك خۆم دەشاردەوە تا بینیم ئەوەی كە وام لێ دەكات كە بیخوازم، هاوسەرگیریم لەگەڵیدا كرد».

## بَابٌ فِي الْوَلِيِّ

### باسێك دەربارەی سەرپەشتیار

٣٢٦. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ نَكَحَتْ بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهَا، فَنِكَاحُهَا بَاطِلٌ»، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، «فَإِنْ دَخَلَ بِهَا فَالْمَهْرُ لَهَا بِمَا أَصَابَ مِنْهَا، فَإِنْ تَشَاجَرُوا فَالسُّلْطَانُ وَلِيُّ مَنْ لَا وَلِيَّ لَهُ».

**عائیشه ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر ئافرەتێك: شوو بكات بەبێ مۆڵەتی سەرپەرشتیاری، ئەو مارەبڕینە پووچەڵە»، سێ جار (فەرمووی: بەتاڵە)، «ئەگەر ئەو كەسە گواستیەوە ئەوە ئەو ئافرەتە مارەیی خۆی وەردەگرێت لەبەر ئەوەی ئەو كەسە گواستوویەتیەوە چۆتە لای، ئەگەر هاتوو سەرپەرشتیارەكان كێشەیان كەوتە نێوانەوە، ئەوا حاكم وەلی هەر كەسێكە كە وەلی نەبێت».**

٣٢٧. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ».

**ئەبو مووسا ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هیچ مارەبڕینێك بەبێ (مۆڵەتی) سەرپەرشتیار دانامەزرێت».**

## بَابٌ فِي الِاسْتِئْمَارِ

### باسێك دەربارەی وەرگرتنی بۆچوونی ئافرەت (كاتی مارەبڕین)

٣٢٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تُنْكَحُ الثَّيِّبُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلَا الْبِكْرُ إِلَّا بِإِذْنِهَا»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا إِذْنُهَا؟ قَالَ: «أَنْ تَسْكُتَ».

**ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «بێوەژن مارە**

نابڕدرێت تا قسە و فەرمانی لێ وەرنەگیرێت، کچیش مارە نابڕدرێت تا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێت»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا مۆڵەتوەرگرتنی کچ چۆنە؟ فەرمووی: «بێدەنگبوونیەتی».

٣٢٩. عَنْ خَنْسَاءَ بِنْتِ خِذَامٍ الْأَنْصَارِيَّةِ ﵂: أَنَّ أَبَاهَا زَوَّجَهَا وَهِيَ ثَيِّبٌ فَكَرِهَتْ ذَلِكَ فَجَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لَهُ، فَرَدَّ نِكَاحَهَا.

خەنسائی کچی خیزامی ئەنصاری ﵂ دەگێڕێتەوە: بێوەژن بووە و باوکی بەشووی داوە، ئەو هاوسەرگیرییەی پێناخۆش بووە، دێت بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس دەکات (باوکم بەشووی داوم و منیش ڕازی نیم)، پێغەمبەر ﷺ مارەبڕینەکەی هەڵوەشاندەوە.



## بَابُ الصَّدَاقِ

### باسی مارەیی

٣٣٠. عَنْ أَبِي الْعَجْفَاءِ السُّلَمِيِّ قَالَ: خَطَبَنَا عُمَرُ ﵁، فَقَالَ: أَلَا لَا تُغَالُوا بِصُدُقِ النِّسَاءِ، فَإِنَّهَا لَوْ كَانَتْ مَكْرُمَةً فِي الدُّنْيَا، أَوْ تَقْوَى عِنْدَ اللَّهِ لَكَانَ أَوْلَاكُمْ بِهَا النَّبِيُّ ﷺ، مَا أَصْدَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِهِ، وَلَا أُصْدِقَتْ امْرَأَةٌ مِنْ بَنَاتِهِ أَكْثَرَ مِنْ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً.

ئەبو عەجفائی سولەمیی دەڵێت: عومەر ﵁ وتاری بۆ داین، گوتی: ئاگادار بن زێدەڕۆیی نەکەن لە دانانی مارەیی ئافرەتدا، ئەگەر دانانی مارەیی زۆر نیشانەی ڕێزلێنان بووایە بۆ ئافرەت لە دونیا، یان تەقوای خوا بووایە، ئەوە پێغەمبەر ﷺ لە هەمووتان لەپێشتر بوو کە ئەو کارەی بکردایە، پێغەمبەری خوا ﷺ مارەیی بۆ هیچ ئافرەتێك لە خێزانەکانی دانەناوە، مارەییش بۆ هیچ یەکێك لە کچەکانی پێغەمبەر

ﷺ دانەنراوە، زیاتر بێت لە دوازدە ئۆقیە.

## بَابُ مَا يُقَالُ لِلْمُتَزَوِّجِ

### باسی ئەوەی دەگوترێت وەك پیرۆزبایی بۆ كەسی تازە زەواجكردوو

٣٣١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا رَفَّأَ الْإِنْسَانَ إِذَا تَزَوَّجَ، قَالَ: «بَارَكَ اللَّهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي خَيْرٍ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ كە پیرۆزبایی لە كەسێك بكردایە كە ژنی بهێنایە و بیگواستایەتەوە، دەیفەرموو: «خوا بۆت بكاتە مایەی فەڕ و خێر، هەروەها پیت و فەڕت بەسەردا بڕژێنێت، لەسەر چاكە و خێر كۆتان بكاتەوە (ژیانتان و منداڵتان بەرەكەتدار بێت)».

## بَابٌ فِي الْقَسْمِ بَيْنَ النِّسَاءِ

### باسێك دەربارەی دابەشكردنی شەوەكان لە نێوان هاوسەراندا

٣٣٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَتْ لَهُ امْرَأَتَانِ فَمَالَ إِلَى إِحْدَاهُمَا، جَاءَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَشِقُّهُ مَائِلٌ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «هەر پیاوێك دوو خێزانی هەبێت بەلای یەكێكیاندا لاری بكاتەوە (نادادگەر بێت)، لە ڕۆژی قیامەتدا دێت و لایەكی لارە (شانی خوارە)».

٣٣٣. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ سَفَرًا

أَقْرَعَ بَيْنَ نِسَائِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ، وَكَانَ يَقْسِمُ لِكُلِّ امْرَأَةٍ مِنْهُنَّ يَوْمَهَا، وَلَيْلَتَهَا غَيْرَ أَنَّ سَوْدَةَ بِنْتَ زَمْعَةَ وَهَبَتْ يَوْمَهَا لِعَائِشَةَ.

عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێك دەیویست سەفەرێك بکات، یان غەزایەك بکات تیروپشکی لە نێوان خێزانەکانیدا دەکرد، هەر کامێکیان دەرچووایە ئەوەی لەگەڵ خۆیدا دەبرد، بۆ هەر خێزانێکیش شەو و ڕۆژێکی دانابوو، بەڵام سەودەی کچی زەمعە شەوەکەی خۆی بەخشی بە (دایکمان) عائیشە.

## بَابٌ فِي الرَّجُلِ يَشْتَرِطُ لَهَا دَارَهَا

### باسی پیاوێك ژنەکەی مەرجی بۆ دابنێت کە لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە

٣٣٤. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّ أَحَقَّ الشُّرُوطِ أَنْ تُوفُوا بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ».

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «شایستەترین مەرج کە شایەنی جێبەجێکردن بێت، ئەو مەرجەیە کە بەهۆیەوە ئافرەتتان بۆ حەڵاڵ بووە».

## بَابٌ فِي حَقِّ الْمَرْأَةِ عَلَى زَوْجِهَا

### باسێك دەربارەی مافی ئافرەت لەسەر پیاوەکەی

٣٣٥. عَنْ مُعَاوِيَةَ الْقُشَيْرِيِّ ﵁ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: فَقُلْتُ: مَا تَقُولُ: فِي نِسَائِنَا؟ قَالَ: «أَطْعِمُوهُنَّ مِمَّا تَأْكُلُونَ، وَاكْسُوهُنَّ مِمَّا تَكْتَسُونَ، وَلَا تَضْرِبُوهُنَّ، وَلَا تُقَبِّحُوهُنَّ».

موعاویەی قوشەیری ﷺ دەڵێت: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێم گوت: چی دەڵێیت دەربارەی خێزانەکانمان؟ فەرمووی: «جا خۆتان چی دەخۆن ئەوەیان بدەنێ بیخۆن، چی دەپۆشن لەو پۆشاکەش بیاندەنێ بیپۆشن، لێیان مەدەن و مەڵێن ئەم شوێنەت ناشیرینە (نەڵێیت خوا ناشیرین و ڕیسوات بکات)».

## بَابُ فِي ضَرْبِ النِّسَاءِ

### باسێك دەربارەی لێدانی ئافرەتان

٣٣٦. عَنْ إِيَاسِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَضْرِبُوا إِمَاءَ اللَّهِ».

ئیاسی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو زوباب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە ئافرەتانی بەندەی خوا مەدەن».

تێبینی:

پیاو (عَبْدُ الله)یە، ئافرەتیش (أَمَةٌ لله)یە، هەردووکی واتە: بەندەی خوا.

## بَابُ مَا يُؤْمَرُ بِهِ مِنْ غَضِّ الْبَصَرِ

### باسی ئەوەی فەرمان کراوە بە چاوداخستن لە حەرام

٣٣٧. عَنْ جَرِيرٍ ﷺ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ نَظْرَةِ الْفَجْأَةِ؟ فَقَالَ: «اصْرِفْ بَصَرَكَ».

جەریر ﷺ دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی سەیرکردنی لەپڕ

و لەناکاو؟ فەرمووی: «چاوت وەرگێڕە و تەماشای مەکە».

٣٣٨. عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِعَلِيٍّ: «يَا عَلِيُّ لَا تُتْبِعِ النَّظْرَةَ النَّظْرَةَ، فَإِنَّ لَكَ الْأُولَى وَلَيْسَتْ لَكَ الْآخِرَةُ».

ئیبن بوڕەیدە، لە باوکییەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەلی فەرموو: «ئەی عەلی یەك لەدوای یەك تەماشای ئافرەت مەکە، بەڵکوو یەکەمجار کە بەرچاوت کەوت ئەوا ئاساییە (لەبەر ئەوەی بەبێ مەبەست بووە گوناهبار نابیت)، بەڵام ئەمەی دووەمجار (کە بەویستی خۆت تەماشا دەکەیت) ئەوە گوناهبار دەبیت».

٣٣٩. عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُبَاشِرُ الْمَرْأَةُ الْمَرْأَةَ، لِتَنْعَتَهَا لِزَوْجِهَا كَأَنَّمَا يَنْظُرُ إِلَيْهَا».



ئیبن مەسعوود رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نابێت ژن زۆر تێکەڵی ژنێکی دیکە بێت و سەرنجی بدات و بە جۆرێك بۆ مێردەکەی باس بکات کە وەکوو (پیاوەکە خۆی) بینیبێتی ئاوا بێت».

٣٤٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لِكُلِّ ابْنِ آدَمَ حَظُّهُ مِنَ الزِّنَا». بِهَذِهِ الْقِصَّةِ قَالَ: «وَالْيَدَانِ تَزْنِيَانِ فَزِنَاهُمَا الْبَطْشُ، وَالرِّجْلَانِ تَزْنِيَانِ فَزِنَاهُمَا الْمَشْيُ، وَالْفَمُ يَزْنِي فَزِنَاهُ الْقُبَلُ».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەموو ئادەمیزادێك بەشی خۆی تووشی زینا دەبێت»، هەمان شت باس دەکات، دەفەرموێت: «هەردوو دەستیش زینا دەکەن زیناکردنیان دەستبەرکەوتنە (دەستیان بەر ئافرەتی نامەحرەم بکەوێت)، هەردوو پێ زینا دەکەن زینای پێ ڕۆیشتنە (هەنگاونانە بۆ ئەو شوێنە خراپانە)، دەمیش زینا دەکات زینای دەم ماچکردنە».

٣٤١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِهَذِهِ الْقِصَّةِ قَالَ: «وَالْأُذُنُ زِنَاهَا الِاسْتِمَاعُ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ هەمان بەسەرهات لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، کە تێیدا فەرموویەتی: «گوێش زینا دەکات، زینای گوێ بریتییە لە بیستن (گوێگرتن بۆ باسکردنی شتی فاحیشە، دەبێت مرۆڤ ـ دڵ و دەست و دەم و گوێ و چاوی بپارێزێت)».

## بَابُ فِي جَامِعِ النِّكَاحِ

### باسێك دەربارەی کۆباسی هاوسەرگیری

٣٤٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ، قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، ثُمَّ قُدِّرَ أَنْ يَكُونَ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِي ذَلِكَ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَدًا».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی بچێتە لای خێزانی (بۆ سەرجێیی)، بڵێت: بە ناوی خوا، خوایە شەیتانمان لێ دوور بخەرەوە و شەیتانیش دوور خەیتەوە لەو منداڵەی کە پێمان دەبەخشیت، پاشان ئەگەر لەو پڕۆسەدا خوا تەقدیری بکات و منداڵیان ببێت ئەوە هەرگیز شەیتان زەرەر بەو منداڵە ناگەیەنێت».

## بَابُ فِي كَفَّارَةِ مَنْ أَتَى حَائِضًا

### باسێك دەربارەی کەفارەتی پیاوێك بچێتە لای خێزانی لە حەیزدا

٣٤٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: فِي الَّذِي يَأْتِي امْرَأَتَهُ وَهِيَ حَائِضٌ؟ قَالَ: «يَتَصَدَّقُ بِدِينَارٍ، أَوْ بِنِصْفِ دِينَارٍ».

ئیبن عەبباس ﭬ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پرسیاری لێ کراوە دەربارەی کەسێك بچێتە لای خێزانی لە حەیزدا؟ فەرمووی: «(کەفارەتی ئەوەیە) دینارێك، یاخود نیو دینار بکاتە خێر و صەدەقە».

# كِتَابُ الطَّلَاقِ

## پەرتووکی تەڵاق (جیابوونەوە)

### أَبْوَابُ تَفْرِيعِ أَبْوَابِ الطَّلَاقِ

### کۆباسەکانی بابەتی جیابوونەوە (طلاق)



### بَابٌ فِيمَنْ خَبَّبَ امْرَأَةً عَلَى زَوْجِهَا

### باسێك دەربارەی ئەو پیاوەی ژنێك لە مێردەکەی هەڵدەگێڕێتەوە (خۆی مارەی دەکات)

٣٤٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ خَبَّبَ امْرَأَةً عَلَى زَوْجِهَا، أَوْ عَبْدًا عَلَى سَيِّدِهِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە ئێمە نییە کەسێك ئافرەت لە مێردەکەی هەڵگەڕێنێتەوە و کێشە بخاتە نێوانیانەوە و بیخەڵەتێنێت، یاخود کۆیلەیەك لە گەورەکەی بکات».

## بَابٌ فِي الْمَرْأَةِ تَسْأَلُ زَوْجَهَا طَلَاقَ امْرَأَةٍ لَهُ

### باسێك دەربارەی ئافرەتێك داوا لە پیاوەکەی دەکات کە هاوسەرەکەی تەڵاق بدات

٣٤٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَسْأَلِ الْمَرْأَةُ طَلَاقَ أُخْتِهَا لِتَسْتَفْرِغَ صَحْفَتَهَا وَلِتَنْكِحَ، فَإِنَّمَا لَهَا مَا قُدِّرَ لَهَا».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «با ئافرەتێك داوای تەڵاقی خوشکەکەی نەکات[1] بۆئەوەی قاپەکەی ئەم بەتاڵ بێت و هەمووی بۆ ئەو بێت، با شوو بکات، ئەوەی کە خوا بۆ ئەوی تەقدیر کردووە دەستی دەکەوێت».

## بَابٌ فِي طَلَاقِ السُّنَّةِ

### باسێك دەربارەی تەڵاقی سوننی (شەرعی)

٣٤٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ، وَهِيَ حَائِضٌ، فَذَكَرَ ذَلِكَ عُمَرُ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُطَلِّقْهَا إِذَا طَهُرَتْ، أَوْ وَهِيَ حَامِلٌ».

لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما دەگێڕنەوە: خێزانەکەی لە سووڕی مانگانەدا تەڵاق دا، عومەریش رضي الله عنه ئەم بابەتەی بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرد، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «پێی بڵێ (فەرمانی پێ بکە) با بیگێڕێتەوە ژێر نیکاحی خۆی، پاشان هەر کات پاك بۆوە (نەچێتە لای) یان هەر کات دەرکەوت دووگیانە، ئەوکات تەڵاقی بدات».

---

(١) خوشکە ئایینییەکەی، بۆیە دەفەرموێت: خوشکی، بۆ ئەوەی کە زیاتر ڕەحم و سۆزی بۆی هەبێت، لەبەر ئەوەی ئافرەتی وا هەیە کاتێك پیاو دەچێتە داخوازیی، دەڵێت: شووت پێ ناکەم تا خێزانەکەت تەڵاق نەدەیت، بۆیە داوای تەڵاقدانی خوشکە دینییەکەت مەکە.

## بَابٌ فِيمَا عُنِيَ بِهِ الطَّلَاقُ وَالنِّيَّاتُ

### باسێك دەربارەی پەیوەندیی نیەت بە تەڵاقەوە

٣٤٧. عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوِ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ».

عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان (قبووڵبوونی) کردەوەکان بەپێی نیازەکانە، هەموو کەسێك بە پێی نیازەکەی پاداشت دەدرێتەوە، جا هەر کەسێك کۆچکردنی بۆ لای خوا و پێغەمبەری خوا بێت، ئەوە کۆچکردنەکەی بۆ لای خوا و پێغەمبەری خوایە، هەر کەسێك کۆچکردنی بۆ بەدەستهێنانی (دەستکەوتێکی) دونیایی بێت، یان بۆ مارەکردنی ئافرەتێك بێت، ئەوە کۆچکردنەکەی بۆ ئەوەیە کە کۆچی بۆ کردووە».

## بَابٌ فِي الْوَسْوَسَةِ بِالطَّلَاقِ

### باسێك دەربارەی پەیوەندیی خوتخوتە بە تەڵاقەوە

٣٤٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ تَجَاوَزَ لِأُمَّتِي عَمَّا لَمْ تَتَكَلَّمْ بِهِ، أَوْ تَعْمَلْ بِهِ، وَبِمَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «بێگومان خوا چاوپۆشیی کردووە لە ئوممەتەکەم لە شتێك کە بە قسە نەیڵێت، یان کردەوەیەك کە ئەنجامی نەدات، هەروەها لەو شتەش کە لە دڵی خۆیدا دەیڵێت».

تێبینی:

واتە ئەگەر شتێك بە دڵی مرۆڤدا بێت و قسەیەکی خراپ بێت، ئەوە ئەگەر قسەکە نەکات لەسەری حیساب نییە، ئەگەر کردەوەش بێت، مادام کردەوەکە ئەنجام نەدات دیسان لەسەری حیساب ناکرێت.

## بَابٌ فِي الْخُلْعِ

### باسێك دەربارەی خولع (خۆدارنینی ژن لە مێردەکەی)

٣٤٩. عَنْ ثَوْبَانَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلَاقًا فِي غَيْرِ مَا بَأْسٍ، فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الْجَنَّةِ».



سەوبان ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر ئافرەتێك داوای تەڵاق بکات لە مێردەکەی، بەبێ هیچ هۆکارێکی شەرعی ئەوە بۆنی بەهەشت حەرامە لەو ئافرەتە (بۆنی بەهەشت ناکات)».

## بَابٌ إِلَى مَتَى تُرَدُّ عَلَيْهِ امْرَأَتُهُ إِذَا أَسْلَمَ بَعْدَهَا؟

### باسێك: ئایا ئەگەر مێرد بووە موسوڵمان ژنەکەی بۆ دەگەڕێندرێتەوە؟

٣٥٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: رَدَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ابْنَتَهُ زَيْنَبَ عَلَى أَبِي الْعَاصِ بِالنِّكَاحِ الْأَوَّلِ. لَمْ يُحْدِثْ شَيْئًا، قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ عَمْرٍو، فِي حَدِيثِهِ: بَعْدَ سِتِّ سِنِينَ، وَقَالَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ: بَعْدَ سَنَتَيْنِ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ زەینەبی کچی دایەوە بە ئەبولعاص هەر بە مارەکردنی پێشوو، هیچ شتێکی نوێ ڕووی نەدا. موحەممەدی کوڕی عەمر

له گێڕانەوەکەی خۆیدا دەڵێت: له دوای شەش ساڵ پێی دایەوە. حەسەنی کوڕی عەلی دەڵێت: له دوای دوو ساڵ.

تێبینی:

مەبەست ئەوەیە ژن و پیاوێك ناموسوڵمانن، ژنەکە سەرەتا موسوڵمان دەبێت و جیا دەبێتەوە لە پیاوەکە، ئایا دوای ئەوەی ماوەیەکی بەسەردا دەڕوات پیاوەکە دەبێتە موسوڵمان ژنەکەی خۆی پێ دەدرێتەوە؟ بەپێی ئەم فەرموودە بەڵێ پێی دەدرێتەوە.

## بَابُ الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ

### باسی ئەوەی کە منداڵ لەسەر جێگەی کێ لەدایك ببێت هی ئەوە



٣٥١. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: اخْتَصَمَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، وَعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي ابْنِ أَمَةِ زَمْعَةَ، فَقَالَ سَعْدٌ: أَوْصَانِي أَخِي عُتْبَةُ إِذَا قَدِمْتُ مَكَّةَ أَنْ أَنْظُرَ إِلَى ابْنِ أَمَةِ زَمْعَةَ فَأَقْبِضَهُ فَإِنَّهُ ابْنُهُ، وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: أَخِي ابْنُ أَمَةِ أَبِي، وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي، فَرَأَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَبَهًا بَيِّنًا بِعُتْبَةَ، فَقَالَ: «الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ، وَاحْتَجِبِي عَنْهُ يَا سَوْدَةُ»، زَادَ مُسَدَّد فِي حَدِيثِهِ، وَقَالَ: «هُوَ أَخُوكَ يَا عَبْدُ».

عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەگێڕێتەوە: سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لەگەڵ عەبدی کوڕی زەمعە لەسەر کوڕێکی کەنیزەکی زەمعە لێیان بوو بە کێشە، (کێشەکەیان برد) بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، سەعد گوتی: عوتبەی برام ڕایسپاردم کە هەر کات هاتمەوە مەککە بەدوای کوڕی کەنیزەکی زەمعەدا بگەڕێم و وەریبگرمەوە، چونکە کوڕیەتی، عەبدی کوڕی زەمعەش گوتی: کوڕی کەنیزەکی باوکمە بۆیە برامە، لەنێو نوێنی باوکمدا لەدایك بووە، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ بینیی کە بەئاشکرا دیارە کە بە عوتبە دەچێت، بۆیە فەرمووی: «منداڵ هیی سەر جێگا و نوێنە (هیی خاوەن

جێگەیە) و داوێنپیسیش تەنها دەستخەڕۆیی و خەسارەتمەندی بۆ دەمێنێتەوە، ئەی سەودە (کە کچی زەمعە بوو) خۆتی لێ پەنا بدە (و بە مەحرەمی مەزانە)»، موسەددەد لە گێڕانەوەکەیدا ئەوەشی زیاد کردووە، هەروەها فەرمووی: «ئەوە برای تۆیە ئەی عەبد».

## بَابٌ فِي الْمُرَاجَعَةِ

### باسێك دەربارەی گێڕانەوەی ئافرەت (دوای تەڵاقدان)

٣٥٢. عَنْ عُمَرَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَلَّقَ حَفْصَةَ، ثُمَّ رَاجَعَهَا.

عومەر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ حەفصەی (کچی پێشەوا عومەری) تەڵاق دا (کە خێزانی بوو)، پاشان گەڕاندیەوە.

## بَابٌ فِي عِدَّةِ أُمِّ الْوَلَدِ

### باسێك دەربارەی کەنیزەکێك کە مێردەکەی بمرێت (ئایا عیددەی ئەم چەندە؟)

٣٥٣. عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵁ قَالَ: «لَا تُلَبِّسُوا عَلَيْنَا سُنَّةً»، قَالَ ابْنُ الْمُثَنَّى: «سُنَّةَ نَبِيِّنَا ﷺ عِدَّةُ الْمُتَوَفَّى عَنْهَا أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ يَعْنِي أُمَّ الْوَلَدِ».

عەمری کوڕی عاص ﵁ دەڵێت: سوننەتەکەمان لێ تێك مەدەن، ئیبن موسەننا دەڵێت: سوننەتی پێغەمبەرمانە ﷺ (لێیان تێکەڵ مەکەن)، کەنیزەکیش کە مێردەکەی بمرێت عیددەکەی هەر چوار مانگ و دە ڕۆژە، وەکوو ئافرەتی ئازاد وایە.

## بَابُ الْمَبْتُوتَةِ لَا يَرْجِعُ إِلَيْهَا زَوْجُهَا حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ

### باسی ئافرەتی سێ جار تەڵاقدراو ناتوانێت شوو بکاتەوە بە مێردەکەی، تا شوو بە پیاوێکی دیکە نەکات

٣٥٤. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، عَنْ رَجُلٍ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ - يَعْنِي ثَلَاثًا - فَتَزَوَّجَتْ زَوْجًا غَيْرَهُ، فَدَخَلَ بِهَا، ثُمَّ طَلَّقَهَا قَبْلَ أَنْ يُوَاقِعَهَا أَتَحِلُّ لِزَوْجِهَا الْأَوَّلِ؟ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تَحِلُّ لِلْأَوَّلِ حَتَّى تَذُوقَ عُسَيْلَةَ الْآخَرِ، وَيَذُوقَ عُسَيْلَتَهَا».

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی پیاوێك خێزانەکەی تەڵاق داوە، -واتە: تەڵاقی سێیەم-، شووی کرد بە پیاوێکی دیکە و ئەو پیاوە گواستیەوە، بەڵام ئەو پیاوە تەڵاقی دەدات پێش ئەوەی سەرجێیی لەگەڵدا بکات، ئایا بۆ مێردی یەکەمی حەڵاڵ دەبێت؟ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «بۆ مێردی یەکەمی حەڵاڵ نییە تا سەرجێیی لەگەڵدا نەکات و چێژ لەم پیاوە دەبینێت و پیاوەکەش چێژ لەو دەبینێت».

## بَابٌ فِي تَعْظِيمِ الزِّنَا

### باسێك دەربارەی بەگەورەزانینی زینا

٣٥٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: «أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ»، قَالَ: فَقُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ مَخَافَةَ أَنْ يَأْكُلَ مَعَكَ»، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ أَيٌّ؟ قَالَ: «أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلَةَ جَارِكَ»، قَالَ: وَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى تَصْدِيقَ قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ} الفرقان: ٦٨، الْآيَةَ.

عەبدوڵڵا رضي الله عنه دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، چ گوناهێك لە هەموو گوناهان

گەورەترە؟ فەرمووی: «تۆ هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدەیت، کەسێك بکەیتە هاوشێوەی خوا لە کاتێکدا خوا تۆی دروست کردووە»، دەڵێت: گوتم: ئەی لەدوای ئەوە؟ فەرمووی: «منداڵەکەت بکوژیت لە ترسی ئەوەی نەك لەگەڵتدا نان بخوات»، دەڵێت: گوتم: ئەی لەدوای ئەوە؟ فەرمووی: «زینا بکەیت لەگەڵ خێزانی هاوسێکەتدا»، دەڵێت: ئەم ئایەتە دابەزی وەکوو پشتڕاستکردنەوەی فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ}، واتە: ئەوانەی کە لەگەڵ خوادا هیچ پەرستراوێکی دیکە ناکەنە هاوبەش بۆ خوا، ئەو نەفسەی خوا حەرامی کردووە نایکوژن تەنها بەهەق نەبێت، زیناش ناکەن.

٣٥٦. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما يَقُولُ: جَاءَتْ مِسْكِينَةُ لِبَعْضِ الْأَنْصَارِ، فَقَالَتْ: إِنَّ سَيِّدِي يُكْرِهُنِي عَلَى الْبِغَاءِ فَنَزَلَ فِي ذَلِكَ: {وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ} النور: ٣٣.



جابیری کوڕی عەبدوڵڵا رضي الله عنهما دەڵێت: میسکینە هات بۆلای یەکێك لە ئەنصارییەکان، گوتی: گەورەکەم تۆبزیم لێ دەکات بۆ زیناکردن، ئیدی ئەو ئایەتە لەسەر ئەوە دابەزی: {وَلَا تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ}، واتە: تۆبزی لە کەنیزەکەکانتان مەکەن بۆ داوێنپیسی.

تێبینی:

ئەو ئایەتە مەفهومی موخالەفەی لێ وەرناگیرێت، واتە کە دەفەرموێت: زۆریان لێ مەکەن مادام خۆیان داوێنپاکن، مانای ئەوە نییە ئەگەر خۆیان پێیانخۆش بێت ڕێگەیان پێ بدرێت.

# كِتَابُ الصَّوْمِ

## پەرتووکی ڕۆژوو

### بَابُ الشَّهْرِ يَكُونُ تِسْعًا وَعِشْرِينَ

### باسی مانگی کۆچی (جار وایە سییە) جاری وایە بیست و نۆیە



٣٥٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ لَا نَكْتُبُ، وَلَا نَحْسُبُ، الشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا»، وَخَنَسَ سُلَيْمَانُ أُصْبُعَهُ فِي الثَّالِثَةِ، يَعْنِي تِسْعًا وَعِشْرِينَ وَثَلَاثِينَ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئێمەی عەرەب نەتەوەیەکی نەخوێندەوارین[١]، نووسین و حیساب نازانین، مانگ ئاوا و ئاوا و ئاوایە، (سێ جار دەستەکانی نوقاند، واتا: دە و دە و دە دەکاتە سی)»، (لە ڕاوی کە سولەیمانە) لە سێیەم جاردا جارێکی دیکەیان پەنجە گەورەکەی خەواند، واتە: مانگ هەیە بیست و نۆیە.

---

(١) لەبەر ئەوەی پێشتر کتێبی ئاسمانییان بۆ دانەبەزیوە بەشێوازێکی گشتی خەڵکی نەخوێندەوار بووە، هەر چەندە کەمێکیان تیادا بووە خوێندەوار بوونە.

٣٥٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ، فَلَا تَصُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، وَلَا تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَاقْدُرُوا لَهُ ثَلَاثِينَ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مانگ بیست و نۆیە، بەڕۆژوو مەبن تا مانگ نەبینن (مانگی یەکشەوەی ڕەمەزان)، وە مەیکەن بە جەژن تا مانگ (ی یەکشەوەی شەوال) نەبینن، ئەگەر هەور بوو (مانگ دیار نەبوو)، ئەوە (شەعبان) سی بگرن یان ڕەمەزان سی بگرن».

٣٥٩. عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: لَمَا صُمْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ تِسْعًا وَعِشْرِينَ أَكْثَرَ مِمَّا صُمْنَا مَعَهُ ثَلَاثِينَ.

ئیبن مەسعوود رضي الله عنه دەڵێت: زۆربەی ئەو مانگانەی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەڕۆژوو دەبووین زیاتر بیست و نۆ بووە نەك سی (مانگی کۆچی زۆربەی بیست و نۆیە).



٣٦٠. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «شَهْرَا عِيدٍ لَا يَنْقُصَانِ رَمَضَانُ، وَذُو الْحِجَّةِ».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە، لە باوکیەوە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەردوو مانگەکەی جەژن کەم ناکەن، مانگی جەژن مانگی ڕەمەزانە کە دوای ئەوە مانگی شەوال دێت و جەژنی ڕەمەزانە، مانگی زیلحیججەیە (کە جەژنی قوربانی تیادایە)».

تێبینی:

بە مانگی ڕەمەزان گوتراوە: مانگی جەژن، لەبەر نزیکیی لە جەژنەوە، کۆتا ڕۆژی ڕەمەزان بۆ شەوەکەی مانگی یەکشەوەی شەوال دەبینرێت و جەژنە، بۆیە پێی دەگوترێت ئەم دوو مانگەی جەژن کەم ناکەن، واتە: لە پاداشتدا کەم ناکەن، یاخود

گوتراوە: ئەگەر یەکێکیان بیست و نۆ بێت، ئەوی دیکە سی دەبێت، بەڵکوو مەبەستی کردەوەیە، واتە: کردەوەی چاك لە مانگی ڕەمەزان و لە مانگی زیلحیجەدا پاداشتیان یەکجار زۆرە و کەم ناکات، ئەم دوو مانگە دوو مانگی زۆر پیرۆزن کە مانگی ڕەمەزان و زیلحیجەیە.

## بَابٌ: إِذَا أُغْمِيَ الشَّهْرُ

### باسێك: ئەگەر مانگی یەکشەوەی شەعبان بەهۆی هەور دیار نەبوو

٣٦١. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَحَفَّظُ مِنْ شَعْبَانَ مَا لَا يَتَحَفَّظُ مِنْ غَيْرِهِ، ثُمَّ يَصُومُ لِرُؤْيَةِ رَمَضَانَ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْهِ عَدَّ ثَلَاثِينَ يَوْمًا ثُمَّ صَامَ.

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندەی پارێزگاری دەکرد لە ژماردنی ڕۆژەکانی شەعباندا ئەوەندە پارێزگاری نەدەکرد لە مانگەکانی دیکەدا، پاشان مانگی (یەکشەوەی ڕەمەزانی) ببینیایە بەڕۆژوو دەبوو، ئەگەر هەور بووایە شەعبانی دەکرد بە سی ڕۆژ و دوای ئەوە بەڕۆژوو دەبوو.

٣٦٢. عَنْ حُذَيْفَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُقَدِّمُوا الشَّهْرَ حَتَّى تَرَوُا الْهِلَالَ، أَوْ تُكْمِلُوا الْعِدَّةَ، ثُمَّ صُومُوا حَتَّى تَرَوُا الْهِلَالَ، أَوْ تُكْمِلُوا الْعِدَّةَ».

حوزەیفە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئێوە پێش مانگ بەڕۆژوو مەبن پەلە مەکەن تا مانگ دەبینن، (یان مانگی یەکشەوە دەبینن) یان سی پڕ دەگرن (ئەوە لە شەعباندا کە مانگت بینی ئینجا بەڕۆژوو دەبیت، مانگت نەبینی شەعبان سی پڕ دەکەیت)، پاشان بەڕۆژوو بن تا مانگ دەبینن، یاخود ژمارەکە تەواو دەکەن (بۆ ڕەمەزانیش هەر وایە)».

## بَابُ مَنْ قَالَ: فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَصُومُوا ثَلَاثِينَ

### باسی ئەوەی دەڵێت: ئەگەر هەور بوو ئێوە سی (ڕۆژ) بەڕۆژوو بن

٣٦٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُقَدِّمُوا الشَّهْرَ بِصِيَامِ يَوْمٍ، وَلَا يَوْمَيْنِ إِلَّا أَنْ يَكُونَ شَيْءٌ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ، وَلَا تَصُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، ثُمَّ صُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ حَالَ دُونَهُ غَمَامَةٌ، فَأَتِمُّوا الْعِدَّةَ ثَلَاثِينَ، ثُمَّ أَفْطِرُوا وَالشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پێش ڕەمەزان بە ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ بەڕۆژوو مەبن، جگە لە یەکێك کە ڕۆژووی نەزری لەسەرە، بەڕۆژوو مەبن تا مانگی یەکشەوە (ی ڕەمەزان) دەبینن، پاشان بەڕۆژوو بن (تا لەو سەرەوە) مانگی یەکشەوە (ی شەوال) دەبینن، ئەگەر هەور بەری مانگی گرتبوو، ڕەمەزان بکەن بە سی، پاشان بیکەن بە جەژن، جاری واش هەیە مانگ بیست و نۆیە».

## بَابٌ فِيمَنْ يَصِلُ شَعْبَانَ بِرَمَضَانَ

### باسێك دەربارەی کەسێك هەموو شەعبان بەڕۆژوو دەبێت و دەیگەیەنێت بە ڕەمەزان

٣٦٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تُقَدِّمُوا صَوْمَ رَمَضَانَ بِيَوْمٍ، وَلَا يَوْمَيْنِ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ صَوْمٌ يَصُومُهُ رَجُلٌ، فَلْيَصُمْ ذَلِكَ الصَّوْمَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ پێش ڕەمەزان بەڕۆژوو مەبن، مەگەر هاتوو کەسێك عادەتی وایە بەڕۆژوو دەبێت (یان نەزرێکی لەسەرە)، ئەوە ئاساییە ئەگەر بەڕۆژوو بێت».

## بَابُ فِي شَهَادَةِ الْوَاحِدِ عَلَى رُؤْيَةِ هِلَالِ رَمَضَانَ

### باسێك دەربارەی شایەتیدانی یەك كەس لەسەر بینینی مانگی نوێ (ی یەكشەوەی) ڕەمەزان

٣٦٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: تَرَائِي النَّاسُ الْهِلَالَ، فَأَخْبَرْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، أَنِّي رَأَيْتُهُ فَصَامَهُ، وَأَمَرَ النَّاسَ بِصِيَامِهِ.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: خەڵكی بۆ مانگی یەكشەوەیان دەڕوانی (بۆی دەگەڕان و چاودێرییان دەكرد)، منیش هەواڵم بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا كە من بینیومە، ئەویش خۆی بەڕۆژوو بوو، هەروەها فەرمانیشی بە خەڵك كرد كە بەڕۆژوو بن.

## بَابُ فِي تَوْكِيدِ السُّحُورِ

### باسێك دەربارەی جەختكردنەوە لەسەر پارشێوكردن

٣٦٦. عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ فَصْلَ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا وَصِيَامِ أَهْلِ الْكِتَابِ أَكْلَةُ السَّحَرِ».

عەمری كوڕی عاص ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جیاوازی نێوان ڕۆژووی ئێمە و ڕۆژووی خاوەن كتێبەكان خواردنی پارشێوە».

٣٦٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «نِعْمَ سَحُورُ الْمُؤْمِنِ التَّمْرُ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «باشترین خواردنێك كە بڕوادار لە پارشێودا بیخوات خورمایە».

## بَابُ وَقْتِ السُّحُورِ

### باسی کاتی پارشێوکردن

٣٦٨. عَنْ قَيْسِ بْنِ طَلْقٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُوا وَاشْرَبُوا، وَلَا يَهِيدَنَّكُمُ السَّاطِعُ الْمُصْعِدُ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَعْتَرِضَ لَكُمُ الْأَحْمَرُ».

قەیسی کوڕی تەلق، لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بخۆن و بخۆنەوە، با ئەو ڕووناکییەی کە بەرز دەبێتەوە، ڕێگریتان نەکات لە خواردن و خواردنەوە، بخۆن و بخۆنەوە تا سوورایییەکە بە باری پانیدا دەردەکەوێت».

## بَابٌ فِي الرَّجُلِ يَسْمَعُ النِّدَاءَ وَالْإِنَاءُ عَلَى يَدِهِ

### باسێك دەربارەی ئەو کەسەی گوێی لە بانگ دەبێت و قاپی بەدەستەوەیە

٣٦٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا سَمِعَ أَحَدُكُمُ النِّدَاءَ وَالْإِنَاءُ عَلَى يَدِهِ، فَلَا يَضَعْهُ حَتَّى يَقْضِيَ حَاجَتَهُ مِنْهُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان گوێی لە بانگی بەیانی بوو (بانگی دووەم)، قاپەکە بەدەستیەوە بوو، با داینەنێت تا پێویستی خۆی جێبەجێ دەکات».

## بَابُ مَا يُسْتَحَبُّ مِنْ تَعْجِيلِ الْفِطْرِ

### باسی ئەوەی کە سوننەتە بەپەلە و لە کاتی خۆیدا ڕۆژوو بشکێنرێت

٣٧٠. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُفْطِرُ عَلَى رُطَبَاتٍ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ رُطَبَاتٌ، فَعَلَى تَمَرَاتٍ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ حَسَا حَسَوَاتٍ مِنْ مَاءٍ.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژووی دەشکاند بە چەند دەنکە خورمایەکی تەڕ، پێش ئەوەی نوێژی شێوان بکات، ئەگەر خورما تەڕەکە نەبووایە بە هەر جۆرە خورمایەکی دیکە بووایە ڕۆژووی دەشکاند، ئەگەر نەبووایە سێ قوم ئاوی دەخواردەوە.

## بَابُ الْفِطْرِ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ

### باسی ڕۆژووشکاندن پێش خۆرئاوابوون

٣٧١. عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ ﵄ قَالَتْ: أَفْطَرْنَا يَوْمًا فِي رَمَضَانَ فِي غَيْمٍ، فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ، قَالَ أَبُو أُسَامَةَ: قُلْتُ لِهِشَامٍ: أُمِرُوا بِالْقَضَاءِ، قَالَ: وَبُدٌّ مِنْ ذَلِكَ.

ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ دەڵێت: ڕۆژێکیان لە مانگی ڕەمەزان هەور بوو لەسەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، ڕۆژوومان شکاند وامان زانی خۆر ئاوا بووە، پاشان کە هەورەکە لاچوو خۆر دەرکەوت، ئەبو ئوسامە دەڵێت: بە هیشامم گوت: ئایا فەرمانیان پێ کرا بە قەزاکردنەوەی ئەو ڕۆژە؟ گوتی: هەر دەبێت ئەو شتە بکەن.

## بَابٌ فِي الْوِصَالِ

### باسێك دەربارەی بەڕۆژووبوون بەبێ پچڕاندن (ڕۆژ و شەو)

٣٧٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الوِصَالِ، قَالُوا: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ إِنِّي أُطْعَمُ وَأُسْقَى».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی کردووە لە هاوەڵان ڕۆژوو بگەیەنن بەیەکدی و نەیشکێنن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەتا خۆت ویصال دەکەیت؟ فەرمووی: «من وەکوو ئێوە نیم، من خواردن و خواردنەوەم پێ دەدرێت».



## بَابُ الْغِيبَةِ لِلصَّائِمِ

### باسی غەیبەتکردن بۆ کەسی ڕۆژووەوان

٣٧٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ، وَالْعَمَلَ بِهِ، فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ»..

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك واز لە درۆ و کرداری خراپ نەهێنێت، ئەوە خوا پێویستیی بەوە نییە ئەو واز لە خواردن و خواردنەوەی خۆی بێنێت».

٣٧٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الصِّيَامُ جُنَّةٌ إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ صَائِمًا فَلَا يَرْفُثْ، وَلَا يَجْهَلْ، فَإِنْ امْرُؤٌ قَاتَلَهُ، أَوْ شَاتَمَهُ، فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ، إِنِّي صَائِمٌ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ڕۆژوو قەڵغانە، ئەگەر

یەکێك لە ئێوە بەڕۆژوو بوو با قسەی بێمانا و پووچ نەکات، با نەزانی و نەفامیش نەکات، ئەگەر کەسێکیش شەڕی لەگەڵدا کرد، یان جوێنی پێ دا، با بڵێت: من بەڕۆژووم، من بەڕۆژووم».

## بَابُ الصَّائِمِ يَسْتَقِيءُ عَامِدًا

## باسی کەسی ڕۆژووگر بەئەنقەست خۆی بڕشێنێتەوە

٣٧٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ ذَرَعَهُ قَيْءٌ، وَهُوَ صَائِمٌ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ، وَإِنْ اسْتَقَاءَ فَلْيَقْضِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك بەڕۆژوو بێت و ڕشانەوە زۆری بۆ هێنا و ڕشایەوە، قەزاکردنەوەی لەسەر نییە، بەڵام کەسێك خۆی بڕشێنێتەوە، پێویستە ڕۆژووەکە بگێڕێتەوە».

## بَابُ الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ

## باسی ماچکردن بۆ ڕۆژووەوان

٣٧٦. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَلَكِنَّهُ كَانَ أَمْلَكَ لِإِرْبِهِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ماچی خێزانەکانی دەکرد لە کاتێکدا ئەو بەڕۆژوو بوو، لێیان نزیك دەبووەوە بەڕۆژووش بوو، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو کەس زیاتر خۆی دەگرت.

## بَابُ مَنْ أَكَلَ نَاسِيًا

### باسی کەسێك (ڕۆژووگر) لەبیری چوو شتی خوارد

٣٧٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَكَلْتُ وَشَرِبْتُ نَاسِيًا، وَأَنَا صَائِمٌ؟ فَقَالَ: «اللَّهُ أَطْعَمَكَ وَسَقَاكَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من خواردنم خوارد و خواردنەوەم خواردۆتەوە لەبیرم کردووە و بەڕۆژووش بوومە (ئایا ڕۆژووەکەم شکاوە)؟ فەرمووی: «خوا خواردن و خواردنەوەی بە تۆ بەخشیوە».

## بَابُ تَأْخِيرِ قَضَاءِ رَمَضَانَ

### باسی دواخستنی گێڕانەوەی مانگی ڕەمەزان

٣٧٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ تَقُولُ: إِنْ كَانَ لَيَكُونُ عَلَيَّ الصَّوْمُ مِنْ رَمَضَانَ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقْضِيَهُ حَتَّى يَأْتِيَ شَعْبَانُ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانم لەسەر بوو (قەرزدار دەبووم بەهۆی حەیزەوە)، نەمدەتوانی بیگێڕمەوە هەتا دەگەیشتمەوە مانگی شەعبان.

## بَابُ فِيمَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ

### باسێك دەربارەی ئەو کەسەی مردووە و ڕۆژوو قەرزدار بووە

٣٧٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ»،

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: «هَذَا فِي النَّذْرِ وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك بمرێت و ڕۆژووی لەسەر بێت (قەرزدار بێت)، کەسوکاری ڕۆژووەکەی لەجیاتی دەگرنەوە»، ئەبو داود دەڵێت: ئەمە ڕۆژووی نەزرە، ئەمە وتەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیشە.

## بَابُ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ

### باسی بەڕۆژووبوون لە سەفەردا

٣٨٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ حَمْزَةَ الْأَسْلَمِيَّ، سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي رَجُلٌ أَسْرُدُ الصَّوْمَ أَفَأَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ قَالَ: «صُمْ إِنْ شِئْتَ، وَأَفْطِرْ إِنْ شِئْتَ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: حەمزەی ئەسلەمی ﵁ پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من پیاوێکم بەردەوام بەڕۆژوو دەبم، ڕۆژووەکانم یەك لەدوای یەکە، ئایا لە گەشتدا هەر بەڕۆژوو بم؟ فەرمووی: «ویستت بەڕۆژوو بە، نەتویست بەڕۆژوو مەبە».

## بَابُ اخْتِيَارِ الْفِطْرِ

### باسی هەڵبژاردنی بەڕۆژوونەبوون لە گەشتدا

٣٨١. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، رَأَى رَجُلاً يُظَلَّلُ عَلَيْهِ، وَالزِّحَامُ عَلَيْهِ، فَقَالَ: «لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەشتدا پیاوێکی

بینی سێبەری بۆ کراوە و قەرەباڵەغی لەسەرە، فەرمووی: «لە گەشتدا بەڕۆژووبوون لە چاکەکاریی نییە».

## بَابٌ فِي صَوْمِ الْعِيدَيْنِ

### باسێك دەربارەی بەڕۆژووبوون لە جەژنەکان

٣٨٢. عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ: شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ ﵁ فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ صِيَامِ هَذَيْنِ الْيَوْمَيْنِ، أَمَّا يَوْمُ الْأَضْحَى فَتَأْكُلُونَ مِنْ لَحْمِ نُسُكِكُمْ، وَأَمَّا يَوْمُ الْفِطْرِ فَفِطْرُكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ.

ئەبو عوبەید دەڵێت: لەگەڵ عومەر ﵁ ئامادەی نوێژی جەژن بووم، یەکەمجار نوێژەکەی کرد، پاشان وتاری دا (وەك پێغەمبەری خوا ﷺ)، پاشان گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی بەڕۆژووبوونی ئەم دوو ڕۆژەی کردووە، ڕۆژی جەژنی قوربان، ئێوە قوربانی دەکەن و لە قوربانییەکەی خۆتان دەخۆن، جەژنی ڕەمەزانیش بۆیە جەژنە، لەبەر ئەوەی ئێوە ڕۆژووی ڕەمەزانتان شکاندووە (نابێت تییاندا بەڕۆژوو بن).



## بَابُ النَّهْيِ أَنْ يُخَصَّ يَوْمُ الْجُمُعَةِ بِصَوْمٍ

### باسی ناپەسندی تایبەتکردنی ڕۆژی هەینی بە ڕۆژووگرتن

٣٨٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَصُمْ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، إِلَّا أَنْ يَصُومَ قَبْلَهُ بِيَوْمٍ أَوْ بَعْدَهُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ یەکێکتان (بەتەنها) لە ڕۆژی هەینیدا بەڕۆژوو نەبێت، مەگەر ڕۆژێك پێشی یاخود ڕۆژێك

پاشی بەڕۆژوو بێت».

## بَابُ فِي صَوْمِ الْمُحَرَّمِ

### باسێك دەربارەی بەڕۆژووبوون لە مانگی موحەڕڕەمدا

٣٨٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ، وَإِنَّ أَفْضَلَ الصَّلَاةِ بَعْدَ الْمَفْرُوضَةِ صَلَاةٌ مِنَ اللَّيْلِ»، لَمْ يَقُلْ قُتَيْبَةُ: «شَهْرُ»، قَالَ: «رَمَضَانُ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترین ڕۆژوو لەدوای مانگی ڕەمەزان مانگی خوایە کە مانگی موحەڕڕەمە[1]، باشترین نوێژیش لەدوای نوێژە فەڕزەکان شەونوێژە». قوتەیبە نەیگوتووە: «مانگ»، تەنها گوتوویەتی: «لەدوای ڕەمەزان (نەك لە دوای مانگی ڕەمەزان، واتە: وشەی مانگی نەهێناوە)».

٣٨٥. عَنْ عُثْمَانَ ابْنِ حَكِيمٍ قَالَ: سَأَلْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ عَنْ صِيَامِ رَجَبٍ، فَقَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ لَا يُفْطِرُ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ لَا يَصُومُ.

عوسمانی کوڕی حەکیم دەڵێت: پرسیارم لە سەعیدی کوڕی جوبەیر کرد دەربارەی بەڕۆژووبوون لە مانگی ڕەجەب، گوتی: ئیبن عەبباس ﷺ هەواڵی پێ داوم پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕۆژوو بووە، تا دەمانگوت ئیدی ڕۆژوو ناشکێنێت، ڕۆژووی دەشکاند، تا دەمانگوت ئیدی بەڕۆژوو نابێت.

---

(١) لەبەر ئەوەی دەگوترێت: ناوی مانگەکانی دیکە هەمووی لەپێش ئیسلامدا ناو نراوە، تەنها مانگی موحەڕڕەم لە ئیسلامدا ناو نراوە بە موحەڕڕەم، کە پێیان دەگوت: صەفەری دووەم، پێغەمبەری خوا ﷺ گۆڕی بۆ موحەڕڕەم، بۆیە پێی دەگوترێت: مانگی خوا، ئەگەرنا مانگەکانی دیکە هەمووی مانگی خوایە، بەڵام ئەمە لە ئیسلامدا ناو نراوە.

## بَابٌ فِي صَوْمِ شَعْبَانَ

### باسێك دەربارەی بەڕۆژووبوون لە مانگی شەعباندا

٣٨٦. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ تقُولُ: كَانَ أَحَبَّ الشُّهُورِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَصُومَهُ: شَعْبَانُ، ثُمَّ يَصِلُهُ بِرَمَضَانَ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: خۆشەویستترین مانگ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە تێیدا بەڕۆژوو بێت مانگی شەعبان بووە، پاشان دەیگەیاند بە ڕەمەزان.

## بَابٌ فِي صَوْمِ سِتَّةِ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ

### باسێك دەربارەی ڕۆژووگرتنی شەش ڕۆژ لە شەوال

٣٨٧. عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﵁ صَاحِبِ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ بِسِتٍّ مِنْ شَوَّالٍ، فَكَأَنَّمَا صَامَ الدَّهْرَ».

ئەبو ئەییووب ﵁ هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێك مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت، پاشان شەش ڕۆژ لە شەوال بەدوایدا بەڕۆژوو بێت، وەك ئەوە وایە ساڵ دوازدەی مانگ بەڕۆژوو بووبێت».

## بَابٌ فِي صَوْمِ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ

### باسێك دەربارەی ڕۆژووگرتنی دووشەممە و پێنجشەممان

٣٨٨. عَنْ مَوْلَى أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﵄: أَنَّهُ انْطَلَقَ مَعَ أُسَامَةَ إِلَى وَادِي الْقُرَى فِي

طَلَبِ مَالٍ لَهُ، فَكَانَ يَصُومُ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، فَقَالَ لَهُ مَوْلَاهُ: لِمَ تَصُومُ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، وَأَنْتَ شَيْخٌ كَبِيرٌ؟، فَقَالَ: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَصُومُ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ، وَسُئِلَ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: «إِنَّ أَعْمَالَ الْعِبَادِ تُعْرَضُ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَيَوْمَ الْخَمِيسِ».

خزمەتكاری ئوسامەی كوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە: لەگەڵ ئوسامەی كوڕی زەیددا هاتووە بۆ وادیلقوڕا (شوێنێكە لە نێوان مەدینە و شامدا)، بەدوای ماڵێكی خۆیدا گەڕاوە، (ئوسامەی كوڕی زەید) دووشەممان و پێنجشەممان بەڕۆژوو دەبوو، خزمەتكارەكەی پێی گوت: تۆ پیاوێكی بەساڵاچووی، بۆ دووشەممان و پێنجشەممان بەڕۆژوو دەبیت؟ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دووشەممان و پێنجشەممان بەڕۆژوو دەبوو، پرسیاریان لێ كرد لەو بارەوە، فەرمووی: «كردەوەی مرۆڤ دووشەممان و پێنجشەممان بەرز دەبێتەوە».

## بَابٌ فِي صَوْمِ الْعَشْرِ

### باسێك دەربارەی ڕۆژووگرتنی دە ڕۆژی سەرەتای مانگی زیلحیجە

٣٨٩. عَنْ بَعْضِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُ تِسْعَ ذِي الْحِجَّةِ، وَيَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَثَلَاثَةَ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ، أَوَّلَ اثْنَيْنِ مِنَ الشَّهْرِ وَالْخَمِيسَ.

لە یەكێك لە خێزانەكانی پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕدرێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ نۆیەم ڕۆژی مانگی زیلحیجە بەڕۆژوو دەبوو، ڕۆژی عاشووڕاش بەڕۆژوو دەبوو، سێ ڕۆژیش لە هەموو مانگێدا بەڕۆژوو دەبوو، یەكەم دووشەممە لە مانگدا لەگەڵ پێنجشەممە.

٣٩٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ أَيَّامٍ الْعَمَلُ الصَّالِحُ فِيهَا

أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ الْأَيَّامِ». يَعْنِي أَيَّامَ الْعَشْرِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَلَا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ قَالَ: «وَلَا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، إِلَّا رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، فَلَمْ يَرْجِعْ مِنْ ذَلِكَ بِشَيْءٍ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ ڕۆژانێك نییە کردەوەی چاك تیایاندا خۆشەویستتر بێت لای خوا لەم ڕۆژانەدا»، واتە: دە ڕۆژی سەرەتای مانگی زیلحیججە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تەنانەت جیهادکردنیش لەپێناو خوا؟ فەرمووی: «نەخێر تەنانەت جیهادکردنیش لەپێناو خوا، مەگەر پیاوێك بە خۆی و بە ماڵەکەی دەرچووە بۆ جیهادکردن، نە خۆی دەگەڕێتەوە نە ماڵی دەگەڕێتەوە».

## بَابٌ فِي صَوْمِ الثَّلَاثِ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ

### باسێك دەربارەی ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێکدا

٣٩١. عَنْ ابْنِ مِلْحَانَ الْقَيْسِيِّ عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُنَا أَنْ نَصُومَ الْبِيضَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ، قَالَ: وَقَالَ: «هُنَّ كَهَيْئَةِ الدَّهْرِ».

ئیبن میلحانی قەیسی لە باوکییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ دەکردین سێ ڕۆژی ڕۆژە سپییەکان بەڕۆژوو بین: سێزدە و چواردە و پازدە، فەرمووی: «ڕۆژووگرتنی ئەو سێ ڕۆژە وەك ئەوە وایە ساڵ دوازدەی مانگ بەڕۆژوو بووبێت».

## بَابٌ فِي الصَّائِمِ يُدْعَى إِلَى وَلِيمَةٍ

### باسێك دەربارەی ئەوەی كە ڕۆژووگر بانگ دەكرێت بۆ خواردنی هاوسەرگیری

٣٩٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيُجِبْ، فَإِنْ كَانَ مُفْطِرًا فَلْيَطْعَمْ، وَإِنْ كَانَ صَائِمًا فَلْيُصَلِّ»، قَالَ هِشَامٌ: وَالصَّلَاةُ: الدُّعَاءُ.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر كەسێك لە ئێوە بانگهێشت كرا بۆ وەلیمە، با وەڵام بداتەوە، ئەگەر بەڕۆژوو نەبوو با خواردنەكە بخوات، ئەگەر بەڕۆژووش بوو با دوعایان بۆ بكات». هیشام دەڵێت: (الصلاة)، واتە: دوعا و پاڕانەوە.

## بَابُ الِاعْتِكَافِ

### باسی ئیعتیكاف (لە مزگەوتدا)

٣٩٣. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ، ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دە شەوی كۆتایی (شەو و ڕۆژەكەی) لە مانگی ڕەمەزان ئیعتیكافی دەكرد و لە مزگەوتدا دەمایەوە، تا خوا بردیەوە بۆ لای خۆی، لەدوای خۆی خێزانەكانی ئیعتیكافیان كرد.

تێبینی:

(الِاعْتِكَاف): لە زماندا: مانەوە و پابەندبوونە بە شوێنێكەوە.

لە شەرعدا: مانەوەیە لە مزگەوت، لە کەسێکی دیاریکراو بە شێوازێکی دیاریکراو، بەمەبەستی پەرستنی خوا.

زانایانی موسوڵمان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئیعتیکاف و مانەوە لە مزگەوتدا بۆ عیبادەت سوننەتە و واجب نییە، زیاتر لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان جەختی لێ کراوەتەوە.

## بَابُ الْمُعْتَكِفِ يَدْخُلُ الْبَيْتَ لِحَاجَتِهِ

### باسی ئەو کەسەی لە ئیعتیکافە و دروستە بچێتەوە ماڵەوە بۆ پێویستیی خۆی

٣٩٤. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اعْتَكَفَ يُدْنِي إِلَيَّ رَأْسَهُ فَأُرَجِّلُهُ، وَكَانَ لَا يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلَّا لِحَاجَةِ الْإِنْسَانِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ئیعتیکافی بکردایە سەری دەهێنایە ژوورەوە[1] پرچیم بۆ شانە دەکرد، پێغەمبەر ﷺ نەدەهاتە ژوورەوە تەنها بۆ پێویستیی مرۆڤ نەبێت (وەکوو دەستنوێژگرتنەوە).

(١) دەرگای ژوورەکەی عائیشە هەر لەنێو مزگەوتەکەدا بووە، سەری دەکردە ژوورەوە و سەری لێم نزیک دەکردەوە.

# كِتَابُ الْجِهَادِ

## پەرتووکی تێکۆشان لەپێناو خوادا

### بَابُ مَا جَاءَ فِي الْهِجْرَةِ وَسُكْنَى الْبَدْوِ

### باسی کۆچکردن و شوێنی نیشتەجێبوونی دەشتەکیان

٣٩٥. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁: أَنَّ أَعْرَابِيًّا سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْهِجْرَةِ؟ فَقَالَ: «وَيْحَكَ إِنَّ شَأْنَ الْهِجْرَةِ شَدِيدٌ، فَهَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟»، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَهَلْ تُؤَدِّي صَدَقَتَهَا؟»، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَاعْمَلْ مِنْ وَرَاءِ الْبِحَارِ، فَإِنَّ اللَّهَ لَنْ يَتِرَكَ مِنْ عَمَلِكَ شَيْئًا».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێکی دەشتنشین هات پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ، دەربارەی کۆچکردن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «هاوار بۆ خۆت کاروباری کۆچکردن و هەڵسان بە مافی کۆچکردن زۆر قورسە، ئایا وشترت هەیە؟»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «ئایا زەکاتەکەی دەدەیت؟»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «لەپشتی شار و دێی خۆتەوە کار و عیبادەتی خۆت بکە، ئەوە خوا هیچ لە کار و کردەوەکەت کەم ناکات (پاداشتی تەواوت بۆ دەنووسێت)».

## بَابُ فِي الْهِجْرَةِ هَلِ انْقَطَعَتْ؟

## باسێك دەربارەی ئەوەی ئایا كۆچكردن كۆتایی هاتووە؟

٣٩٦. **عَنْ مُعَاوِيَةَ** ﵁ **قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ **يَقُولُ: «لَا تَنْقَطِعُ الْهِجْرَةُ حَتَّى تَنْقَطِعَ التَّوْبَةُ، وَلَا تَنْقَطِعُ التَّوْبَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا».**

موعاوییە ﵁ دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «هەتا تەوبە كۆتایی نەیەت و نەپچڕێت كۆچكردنیش كۆتایی نایەت و ناپچڕێت، تەوبەش كۆتایی نایەت و ناپچڕێت هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت».

٣٩٧. **عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** ﵄ **قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ **يَوْمَ الْفَتْحِ فَتْحِ مَكَّةَ: «لَا هِجْرَةَ وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا».**



ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: لە ڕۆژی فەتحی مەككەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئیدی كۆچكردن (لە مەككەوە بۆ مەدینە) نەما، بەڵام جیهاد و نیەتی باش هەر دەمێنێت، جا هەر كاتێك داواتان لێ كرا دەربچن (بۆ جەنگ)، دەربچن».

٣٩٨. **عَنْ عَامِرٍ قَالَ: أَتَى رَجُلٌ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرٍو** ﵄ **وَعِنْدَهُ الْقَوْمُ حَتَّى جَلَسَ عِنْدَهُ، فَقَالَ: أَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ** ﷺ، **فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ **يَقُولُ: «الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ».**

عامیر دەڵێت: پیاوێك هاتە لای عەبدوڵڵای كوڕی عەمر ﵄ ئەمیش كۆمەڵێك پیاوی لەلا بوو، ئەویش هات تا لەگەڵیدا لەلایان دانیشت، گوتی: شتێكم پێ بڵێ كە لە پێغەمبەری خوات ﷺ بیستبێت، گوتی: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «موسوڵمان ئەو كەسەیە موسوڵمانان پارێزراو بن لە زمان و لە دەستی،

کۆچکەریش ئەو کەسەیە کە واز بێنێت لەهەر شتێك کە خوا قەدەغەی کردووە».

## بَابٌ فِي دَوَامِ الْجِهَادِ

### باسێك دەربارەی بەردەوامبوونی جیهاد

٣٩٩. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ عَلَى مَنْ نَاوَأَهُمْ، حَتَّى يُقَاتِلَ آخِرُهُمُ الْمَسِيحَ الدَّجَّالَ».

عیمرانی کوڕی حوصەین ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەردەوام کۆمەڵێك لە ئوممەتەکەی من جیهاد دەکەن و لەسەر هەقن، زاڵن بەسەر ئەوانەی کە دژایەتییان دەکەن، تا دوا کەسیان جیهادی مەسیحی دەججال دەکات».

## بَابٌ فِي ثَوَابِ الْجِهَادِ

### باسێك دەربارەی پاداشتی جیهادکردن

٤٠٠. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ سُئِلَ: أَيُّ الْمُؤْمِنِينَ أَكْمَلُ إِيمَانًا؟ قَالَ: «رَجُلٌ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ، وَرَجُلٌ يَعْبُدُ اللَّهَ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ قَدْ كُفِيَ النَّاسُ شَرَّهُ».

ئەبو سەعید ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە پرسیاری لێ کرا: کام بڕوادار بڕواکەی تەواوترە؟ فەرمووی: «پیاوێك جیهاد دەکات لەپێناو خوا بە نەفس و ماڵی خۆی، هەروەها کەسێك لە چیا و چۆڵەکان خواپەرستی دەکات، کە بێگومان خەڵکی لە خراپەی ئەو کەسە پارێزراون».

## بَابٌ فِي فَضْلِ الْقَفْلِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ تَعَالَى

### باسێك دەربارەی گەورەیی گەڕانەوە لە جیهادکردن لەپێناو خوای بەرز

٤٠١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ابْن عَمْرٍو رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «قَفْلَةٌ كَغَزْوَةٍ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر رضي الله عنهما لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوەکە فەرموویەتی: «گەڕانەوە لە جیهاد وەك ڕۆیشتنە بۆ جەنگ و جیهاد».

✍ تێبینی:

لەبەر ئەوەی کە دەگەڕێتەوە ماندوو دەبێت، پشوو دەدات، خۆی بەهێز دەکاتەوە بۆ دوژمن، هەروەها دەگەڕێتەوە نێو کەسوکاری دەیانبینێت، پارێزگارییان لێ دەکات و چاودێرییان دەکات، وەکوو چۆن کەسێك دەچێت بۆ مزگەوت هەموو هەنگاوەکانی بۆ هەژمار دەکرێت و گوناهی لێ دەسڕدرێتەوە بە هەر هەنگاوێك، بە هەر هەنگاوێکی دیکەی خێرێکی بۆ دەنووسرێت، لە گەڕانەوەشدا بەهەمان شت، بۆ جیهادکردنەکەش هەمان شتە.

## بَابٌ فِي فَضْلِ مَنْ قَتَلَ كَافِرًا

### باسێك دەربارەی ئەو کەسەی بێبڕوایەکی کوشتووە

٤٠٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَجْتَمِعُ فِي النَّارِ كَافِرٌ وَقَاتِلُهُ أَبَدًا».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرگیز لە ئاگری دۆزەخدا بێبڕوایەك و بکوژەکەی کۆ نابنەوە».

## بَابٌ فِي السَّرِيَّةِ تَخْفِقُ

### باسێك دەربارەی ئەو سریەی (دەچێت بۆ غەزا) غەنیمەتی دەست ناکەوێت

٤٠٣. عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْن عَمْرٍو رضي الله عنهما يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ غَازِيَةٍ تَغْزُو فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُصِيبُونَ غَنِيمَةً إِلَّا تَعَجَّلُوا ثُلُثَيْ أَجْرِهِمْ مِنَ الْآخِرَةِ، وَيَبْقَى لَهُمُ الثُّلُثُ، فَإِنْ لَمْ يُصِيبُوا غَنِيمَةً تَمَّ لَهُمْ أَجْرُهُمْ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ کۆمەڵە خەڵکێك نییە کە غەزا بکەن لەپێناو خوا و دەستکەوتیان بەربکەوێت، بێگومان دوو لەسەر سێی پاداشتی قیامەتیان بۆ پێش خراوە بۆ دونیا، یەك لەسەر سێی پاداشتەکەیان بۆ قیامەت دەمێنێت، ئەگەر غەزا بکەن و غەنیمەتیان دەست نەکەوێت، پاداشتەکەیان لە قیامەتدا تەواو دەست دەکەوێت».

## بَابٌ فِي فَضْلِ الرِّبَاطِ

### باسێك دەربارەی ئێشکگریی بەرانبەر دوژمن

٤٠٤. عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُّ الْمَيِّتِ يُخْتَمُ عَلَى عَمَلِهِ إِلَّا الْمُرَابِطَ، فَإِنَّهُ يَنْمُو لَهُ عَمَلُهُ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَيُؤَمَّنُ مِنْ فَتَّانِ الْقَبْرِ».

فەزالەی کوڕی عوبەید رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەموو مردوویەك کردەوەکانی کۆتایی دێت (هیچ کردەوەیەکی بۆ نانووسرێت) تەنها کەسێك کە لە بەرانبەر دوژمندا ڕاوەستاوە (کە مردووە یان کوژراوە)، ئەو کردەوەکانی گەشە دەکەن هەتا ڕۆژی قیامەت و پارێزراویشە لە سزای گۆڕ».

## بَابُ كَرَاهِيَةِ تَرْكِ الْغَزْوِ

### باسی ناپەسندی وازهێنان لە غەزا

٤٠٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ مَاتَ وَلَمْ يَغْزُ، وَلَمْ يُحَدِّثْ نَفْسَهُ بِالْغَزْوِ مَاتَ عَلَى شُعْبَةٍ مِنْ نِفَاقٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوەكە فەرموویەتی: «هەر كەسێك بمرێت و غەزا نەكات، یاخود لەگەڵ نەفسی خۆیدا قسە نەكات كە خۆی ئامادە بكات، ئەوە لەسەر لقێك لە لقەكانی دووڕوویی مردووە».

٤٠٦. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «جَاهِدُوا الْمُشْرِكِينَ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَأَلْسِنَتِكُمْ».

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بە ماڵ و گیان و زمانتان جیهادی هاوبەشدانەران بكەن».

## بَابٌ فِي الرُّخْصَةِ فِي الْقُعُودِ مِنَ الْعُذْرِ

### باسێك دەربارەی مۆڵەتدان بۆ كەسی خاوەن پاساو نەچێت بۆ جیهاد

٤٠٧. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَقَدْ تَرَكْتُمْ بِالْمَدِينَةِ أَقْوَامًا مَا سِرْتُمْ مَسِيرًا، وَلَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ نَفَقَةٍ، وَلَا قَطَعْتُمْ مِنْ وَادٍ، إِلَّا وَهُمْ مَعَكُمْ فِيهِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَكَيْفَ يَكُونُونَ مَعَنَا، وَهُمْ بِالْمَدِينَةِ؟ فَقَالَ: «حَبَسَهُمُ الْعُذْرُ».

ئەنەسی كوڕی مالیك ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئێوە لەنێو مەدینە كەسانێكتان بەجێ هێشتووە هیچ شوێنێكتان نەبڕیوە و هیچ خێرێكیشتان

نەکردووە، هیچ دۆڵێکیشتان نەبڕیوە، بێگومان ئەوان لەگەڵتانن (لە پاداشتەکەتاندا))»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن ئەوان (لە پاداشتدا) لەگەڵ ئێمەن کەچی لە مەدینەن؟ فەرمووی: « ئەوان پاساوەکانیان ڕێگریان بوون لەگەڵ ئێوەدا نەیەن».

## بَابُ مَا يُجْزِئُ مِنَ الْغَزْوِ

### باسی ئەندازەی پێویست بۆ تێکۆشان لەپێناو خوا

٤٠٨. عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَهُ فِي أَهْلِهِ بِخَيْرٍ فَقَدْ غَزَا».

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کەسێك موجاهیدێك ئامادە بکات لەپێناو خوا، (ئەوەی کە لە سەفەرەکەی پێویستی پێیەتی)، ئەمە وەك ئەوە وایە خۆی غەزای کردبێت، ئەوەی کە لە ماڵەوە سەرپەرشتیی ماڵ و منداڵی کەسێکی موجاهید بکات و خزمەتیان بکات، ئەویش بەهەمان شێوە وەك ئەوە وایە کە خۆی غەزای کردبێت (بەشدارە لەو پاداشتە))».

## بَابٌ فِي الْجُرْأَةِ وَالْجُبْنِ

### باسێك دەربارەی بوێری و ترسنۆکی

٤٠٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «شَرُّ مَا فِي رَجُلٍ شُحٌّ هَالِعٌ وَجُبْنٌ خَالِعٌ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «خراپترین ڕەوشت لە پیاودا چرووکییەکە کە ترسێنەرە، هەروەها ترسنۆکییەکە کە دڵی

دەربکات لە ترساندا».

## بَابٌ فِي الرَّمْيِ

### باسێك دەربارەی تیرهاویشتن

٤١٠. عَنْ عُقْبَةَ بْن عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ ﵁ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ: {وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ} الأنفال: ٦٠، أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ، أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ».

عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی ﵁ دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر مینبەر دەیفەرموو: «{وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ}، واتە: بۆ کافرانی ئامادە بکەن چەندێك لە تواناتاندا هەیە لە هێز. ئاگادار بن بەدڵنیایی هێز لەم ئایەتە نیشانە شکاندن و تیرهاویشتنە، ئاگادار بن بەدڵنیایی هێز لەم ئایەتە نیشانە شکاندن و تیرهاویشتنە، ئاگادار بن بەدڵنیایی هێز لەم ئایەتە نیشانە شکاندن و تیرهاویشتنە (سێ جار وای فەرموو)».



## بَابُ مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا

### باسی ئەو کەسەی دەجەنگێت بۆ ئەوەی وشەی خوا بەرز بێت

٤١١. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁: أَنَّ أَعْرَابِيًّا جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ الرَّجُلَ يُقَاتِلُ لِلذِّكْرِ، وَيُقَاتِلُ لِيُحْمَدَ، وَيُقَاتِلُ لِيَغْنَمَ، وَيُقَاتِلُ لِيُرِيَ مَكَانَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَاتَلَ حَتَّى تَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ أَعْلَى، فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﷯».

ئەبو مووسا ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ

گوتی: پیاوی وا هەیە جەنگ دەکات بۆ ئەوەی کە باس بکرێت، جەنگ دەکات بۆ ئەوەی کە سوپاس و ستاییش بکرێت، جەنگ دەکات بۆ ئەوەی غەنیمەتی دەست بکەوێت، جەنگ دەکات بۆ ئەوەی کە شوێن و پێگەی دیار بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەر کەسێك بجەنگێت بۆ ئەوەی وشەی خوا بەرزترین بێت، ئەوە لەپێناو خوایە ﷻ (ئەوەی دیکە بۆ دونیایە)».

## بَابٌ فِي فَضْلِ الشَّهَادَةِ

## باسێك دەربارەی پێگە و پاداشتی شەهیدی

٤١٢. عن حَسْنَاءِ بِنْتِ مُعَاوِيَةَ الصَّرِيمِيَّةُ قَالَتْ: حَدَّثَنَا عَمِّي رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: مَنْ فِي الْجَنَّةِ؟ قَالَ: «النَّبِيُّ ﷺ فِي الْجَنَّةِ، وَالشَّهِيدُ فِي الْجَنَّةِ، وَالْمَوْلُودُ فِي الْجَنَّةِ، وَالْوَئِيدُ فِي الْجَنَّةِ».

حەسنائی کچی موعاویەی صەریمییە دەڵێت: مامم رضي الله عنه پێی گوتم، بە پێغەمبەری خوام ﷺ گوت: کێ لە بەهەشتدایە؟ فەرمووی: «پێغەمبەر ﷺ لە بەهەشتدایە، ئەوەی لەپێناو خوا بکوژرێت و شەهید بێت لە بەهەشتدایە، منداڵ لە بەهەشتدایە، ئەو منداڵانەشی کە زیندەبەچاڵ کراون ئەوانیش لە بەهەشتدان».

## بَابٌ فِي الشَّهِيدِ يُشَفَّعُ

## باسێك دەربارەی شەفاعەتکردنی شەهید

٤١٣. عَنْ نِمْرَانِ بْنِ عُتْبَةَ الذِّمَارِيُّ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى أُمِّ الدَّرْدَاءِ وَنَحْنُ أَيْتَامٌ، فَقَالَتْ: أَبْشِرُوا، فَإِنِّي سَمِعْتُ أَبَا الدَّرْدَاءَ رضي الله عنه يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُشَفَّعُ الشَّهِيدُ

فِي سَبْعِينَ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ».

نیمرانی کوڕی عوتبەی زیاری دەڵێت: چووینە لای ئوم دەرداء، ئێمە منداڵی بێباوك بووین، (باوکمان کوژراو بوو لە یەکێك لە غەزاکاندا)، گوتی: موژدە بێت لێتان، من گوێم لە ئەبو دەرداء ﵁ بوو (هاوسەرم) دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «شەهید شەفاعەت دەکات و لێشی وەردەگیرێت بۆ حەفتا کەس لە کەسوکاری خۆی».

## بَابٌ فِي الرَّجُلِ يَغْزُو، وَأَبَوَاهُ كَارِهَانِ

### باسێك دەربارەی ئەو پیاوەی جیهاد دەکات و دایك و باوکی پێیناناخۆشە

٤١٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: جِئْتُ أُبَايِعُكَ عَلَى الْهِجْرَةِ، وَتَرَكْتُ أَبَوَيَّ يَبْكِيَانِ، فَقَالَ: «ارْجِعْ عَلَيْهِمَا فَأَضْحِكْهُمَا كَمَا أَبْكَيْتَهُمَا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: هاتووم بەیعەتت پێ بدەم لەسەر کۆچکردن، دایك و باوکم بەجێ هێشت بەدوامدا دەگریان، فەرمووی: «بگەڕێرەوە بیانخەرەوە پێکەنین هەر وەکوو چۆن گریاندووتن (چۆن دڵت ناخۆش کردوون ئاوا دڵیان خۆش بکەوە)».

٤١٥. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁: أَنَّ رَجُلًا هَاجَرَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْيَمَنِ فَقَالَ: «هَلْ لَكَ أَحَدٌ بِالْيَمَنِ؟»، قَالَ: أَبَوَايَ، قَالَ: «أَذِنَا لَكَ؟». قَالَ: «لَا»، قَالَ: «ارْجِعْ إِلَيْهِمَا فَاسْتَأْذِنْهُمَا، فَإِنْ أَذِنَا لَكَ فَجَاهِدْ، وَإِلَّا فَبِرَّهُمَا».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێك لە یەمەنەوە کۆچی کرد و هات بۆ

خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «کەست لە یەمەن بەجێ هێشتووە؟»، گوتی: بەڵی دایك و باوکم، فەرمووی: «ئایا مۆڵەتیان داویت؟»، گوتی: نەخێر، فەرمووی: «بگەڕێرەوە بۆلایان مۆڵەتیان لێ وەربگرە، ئەگەر مۆڵەتیان دایت جیهاد بکە، ئەگەر مۆڵەتیان نەدایت ئەوە لەگەڵ ئەوان چاکەکار بە».

## بَابٌ فِي النِّسَاءِ يَغْزُونَ

### باسێك دەربارەی غەزاکردنی ئافرەت

٤١٦. عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَغْزُو بِأُمِّ سُلَيْمٍ، وَنِسْوَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ لِيَسْقِينَ الْمَاءَ، وَيُدَاوِينَ الْجَرْحَى.

ئەنەس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئوم سولەیم و ئافرەتانێکی دیکەی لە ئەنصارِ لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆ غەزا بۆئەوەی ئاو بدەن بە موجاهیدەکان، بریندارەکان تیمار بکەن.

## بَابُ الدُّعَاءِ عِنْدَ اللِّقَاءِ

### باسی دوعاکردن لە کاتی پێکگەیشتن (ی سوپای موسوڵمانان و سوپای کافران)

٤١٧. عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثِنْتَانِ لَا تُرَدَّانِ، أَوْ قَلَّمَا تُرَدَّانِ الدُّعَاءُ عِنْدَ النِّدَاءِ، وَعِنْدَ الْبَأْسِ حِينَ يُلْحِمُ بَعْضُهُمْ بَعْضاً».

سەهلی کوڕی سەعد رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دوو دوعا ڕەت ناکرێنەوە، یان زۆر بەکەمی ڕەت دەکرێنەوە، دوعا لە کاتی بانگ و لە کاتی

جەنگدا، لە کاتی تێکرژان لەگەڵ کافران کە هەندێکیان هەندێکیان دەکوژن».

## بَابٌ فِيمَنْ سَأَلَ اللَّهَ تَعَالَى الشَّهَادَةَ

### باسێك دەربارەی کەسێك داوای شەهیدی لە خوای گەورە بکات (خوای گەورە پلەی بەرزی شەهادەتی پێ ببەخشێت)

٤١٨. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ رضي الله عنه: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فُوَاقَ نَاقَةٍ فَقَدْ وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَمَنْ سَأَلَ اللَّهَ الْقَتْلَ مِنْ نَفْسِهِ صَادِقًا، ثُمَّ مَاتَ أَوْ قُتِلَ، فَإِنَّ لَهُ أَجْرَ شَهِيدٍ».

موعازی کوڕی جەبەل رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەسێك لەپێناو خوا جەنگ بکات لە نێوان دوو جار دۆشینی وشتردا (ئەو ماوەیە چەندێکە ئەوەندە)، ئەوە بەهەشتی بۆ پێویست دەبێت، هەر کەسێکیش لە دڵی خۆیەوە بەڕاستگۆیی داوا لە خوا بکات لەپێناو ئەم ئایینەدا شەهیدی پێ ببەخشێت، پاشان بمرێت، یان بکوژرێت، پاداشتی شەهیدیی بۆ هەیە».

## بَابٌ فِي لُبْسِ الدُّرُوعِ

### باسێك دەربارەی لەبەرکردنی قەڵغانەکان (ی جەنگ)

٤١٩. عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ رضي الله عنه عَنْ رَجُلٍ قَدْ سَمَّاهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ظَاهَرَ يَوْمَ أُحُدٍ بَيْنَ دِرْعَيْنِ، أَوْ لَبِسَ دِرْعَيْنِ.

سائیبی کوڕی یەزید لە پیاوێك کە ناوی هێناوە هاوەڵە (نادیاریش بێت زیانی نییە)، دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو قەڵغانی لەسەر یەك لەبەرکردووە لە جەنگی

ئوحوددا (بۆ خۆپاراستن).

## بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا سَافَرَ

### باسی ئەو زیکرەی کەسێك دەیڵێ لە کاتی چوونە گەشتدا

٤٢٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ ﷺ إِذَا سَافَرَ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِي الْأَهْلِ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمُنْقَلَبِ، وَسُوءِ الْمَنْظَرِ فِي الْأَهْلِ وَالْمَالِ، اللَّهُمَّ اطْوِ لَنَا الْأَرْضَ، وَهَوِّنْ عَلَيْنَا السَّفَرَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر سەفەری بکردایە دەیفەرموو: «خوایە تۆ هاوەڵمانی لە سەفەر، خوایە کەسوکارمان لە ماڵەوە بە تۆ دەسپێرین، خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە ناڕەحەتیی ئەم سەفەرە، گۆڕانکاری نەفس لە غەم و خەفەت و ئەو شتانە بمانپارێزە، یان کاتێك کە دەگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە بەغەم و خەفەتەوە نەگەڕێمەوە ئیش و پێویستییەکەم لە سەفەرەکە جێبەجێ نەکرابێت، وە خراپی شێوە لە ماڵ و کەسوکاردا، خوایە زەویمان بۆ لوول بکە (واتە: ڕۆیشتنی تێدا ئاسان بکە)، خوایە سەفەرەکەمان لەسەر ئاسان بکە».

## بَابٌ فِي الدُّعَاءِ عِنْدَ الْوَدَاعِ

### باسێك دەربارەی دوعاکردن لە کاتی ماڵئاواییکردندا

٤٢١. عَنْ قَزَعَةَ قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ عُمَرَ ﵄ هَلُمَّ أُوَدِّعْكَ كَمَا وَدَّعَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، «أَسْتَوْدِعُ اللَّهَ دِينَكَ وَأَمَانَتَكَ وَخَوَاتِيمَ عَمَلِكَ».

قەزەعە دەڵێت: ئیبن عومەر ﵄ پێی گوتم: وەرە با ماڵئاواییت لێ بکەم، هەر وەکوو

چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵئاوایی لە من کرد: «ئایینەکەت و ئەمانەتەکەت وە کۆتا کردەوەت هەمووی بە خوا دەسپێرم».

٤٢٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ الْخَطْمِيِّ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَسْتَوْدِعَ الْجَيْشَ قَالَ: «أَسْتَوْدِعُ اللَّهَ دِينَكُمْ وَأَمَانَتَكُمْ وَخَوَاتِيمَ أَعْمَالِكُمْ».

عەبدوڵڵای خەتمی رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستایە ماڵئاوایی لە سوپایەك بکات، دەیفەرموو: «ئایین و ئەمانەت و کۆتایی کردەوەتان بە خوا دەسپێرم».

## بَابٌ فِي الِابْتِكَارِ فِي السَّفَرِ

## باسێك دەربارەی بەیانی زوو دەرچوون بۆ سەفەر

٤٢٣. عَنْ صَخْرٍ الْغَامِدِيِّ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لِأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا». وَكَانَ إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً أَوْ جَيْشًا بَعَثَهُمْ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ «وَكَانَ صَخْرٌ رَجُلًا تَاجِرًا، وَكَانَ يَبْعَثُ تِجَارَتَهُ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ فَأَثْرَى وَكَثُرَ مَالُهُ».

صەخری غامیدی رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «خوایە بەرەکەت بخەرە کردەوەی ئوممەتەکەم لە بەیانییانی زوودا»، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ سریەیەك، یان سوپایەکی بناردایە، لە سەرەتای ڕۆژدا بەیانی زوو دەینارد، (ڕاوییەکەش) صەخر پیاوێکی بازرگان بووە، ئەمیش بازرگانییەکەی لە بەیانی زوودا دەنارد، دەوڵەمەند بوو و ماڵ و سامانی زۆر بوو.

## بَابٌ فِي الْقَوْمِ يُسَافِرُونَ يُؤَمِّرُونَ أَحَدَهُمْ

### باسێك دەربارەی ئەوانەی گەشت دەكەن و یەكێك دەكەنە گەورەیان

٤٢٤. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا خَرَجَ ثَلَاثَةٌ فِي سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر سێ كەس بۆ سەفەر دەرچوون با یەكێكیان ببێت بە برا گەورە».

## بَابٌ فِي الطَّاعَةِ

### باسێك دەربارەی گوێڕایەڵی (ی فەرمانڕەوایان)

٤٢٥. عَنْ عَلِيٍّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ جَيْشًا وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلًا، وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَسْمَعُوا لَهُ وَيُطِيعُوا، فَأَجَّجَ نَارًا وَأَمَرَهُمْ أَنْ يُقْتَحِمُوا فِيهَا، فَأَبَى قَوْمٌ أَنْ يَدْخُلُوهَا وَقَالُوا: إِنَّمَا فَرَرْنَا مِنَ النَّارِ، وَأَرَادَ قَوْمٌ أَنْ يَدْخُلُوهَا، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «لَوْ دَخَلُوهَا أَوْ دَخَلُوا فِيهَا لَمْ يَزَالُوا فِيهَا»، وَقَالَ: «لَا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ».

عەلی ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ سوپایەكی نارد و پیاوێكی كردە ئەمیریان، فەرمانی پێ كردن گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداری بن، ئەمیرەكەیان ئاگرێك دادەگیرسێنێت و دەڵێت: هەمووتان بچنە نێویەوە، كەسانێك گوتیان: ئێمە ناچینە نێو ئاگرەوە، ئێمە وازمان لە ئایینی باوك و باپیرانمان هێناوە بۆ ئەوەی نەچینە ئاگرەوە، كەسانێك گوتبوویان: دەچینە نێو ئاگرەكەوە، ئەم هەواڵە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت، فەرمووی: «ئەگەر بچونایە نێوی بەردەوام تیایدا دەبوون»، فەرمووی: «گوێڕایەڵی

بۆ هیچ کەسێك نییە لە سەرپێچی خوادا، بەڵکوو گوێڕایەڵی تەنها لە چاکەدا دەبێت».

٤٢٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى الْمَرْءِ الْمُسْلِمِ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِذَا أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلَا سَمْعَ وَلَا طَاعَةَ».

عەبدوڵلا ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «گوێگرتن و گوێڕایەڵی بۆ فەرمانڕەوای موسوڵمان پێویستە لەسەر مرۆڤی موسوڵمان لە هەر شتێك کە پێیخۆش بوو و پێشیناخۆش بوو، مادەم فەرمانت پێ نەکرێت بە سەرپێچی، ئەگەر فەرمان کرا بە سەرپێچی، ئەوە نە گوێگرتن هەیە و نە گوێڕایەڵی هەیە».

## بَابُ مَا يُدْعَى عِنْدَ اللِّقَاءِ

### باسی لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمندا چ دوعایەك بکەیت؟

٤٢٧. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا غَزَا قَالَ: «اللَّهُمَّ أَنْتَ عَضُدِي وَنَصِيرِي، بِكَ أَحُولُ، وَبِكَ أَصُولُ، وَبِكَ أُقَاتِلُ».

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ غەزای بکردایە دەیفەرموو: «خوایە تۆ پشتیوانمی و سەرخەرمی، بەهۆی تۆوە نەخشە و پیلان لادەبەم، بەهۆی تۆوە بەسەر دوژمندا زاڵ دەبم، بە پشتیوانی تۆ جەنگیان لەگەڵدا دەکەم».

## بَابُ الْمَكْرِ فِي الْحَرْبِ

### باسی فێڵکردن لە جەنگدا

٤٢٨. عَنْ جَابِرٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْحَرْبُ خُدَعَةٌ».

جابیر ﷛ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جەنگ فێڵە (واتە: پلان و نەخشەیە)».

## بَابُ عَلَى مَا يُقَاتَلُ الْمُشْرِكُونَ

### باسێك دەربارەی لەسەر چی هاوبەشدانەر جەنگی لەگەڵ دەکرێت

٤٢٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، فَإِذَا قَالُوهَا مَنَعُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلَّا بِحَقِّهَا وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللَّهِ تَعَالَى».

ئەبو هورەیرە ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «فەرمانم پێ کراوە کەوا بجەنگم لەگەڵ خەڵکدا هەتاکوو دەڵێن: (لا إله إلا الله)، جا هەر کات ئەوەیان گوت، ئیدی خوێن و ماڵیان لە من حەرام دەبێت مەگەر بەهەق نەبێت، حیساب و لێپرسینەوەشیان بۆ خوای بەرزە».

تێبینی:

ئەم فەرموودەیە مانای ئەوە نییە کە لەخۆوە بەبێ هۆ هەڵکبوترێتە سەر خەڵك، نا، هەرگیز، مەبەست ئەوەیە کار و گرینگی کاری موسوڵمانان شەڕکردنە لەگەڵ فکرەی بێباوەڕی و ستەم و زۆرداری، جگە لەوەش بڕیاری جەنگ و شەڕ بەشێکە لە سیاسەتی شەرعی و هیچ کەس ناتوانێت لەخۆیەوە بڕیاری لەسەر بدات، بەڵکوو ئەوە پەیوەستە بە دەسەڵات و دەوڵەت و بەرژەوەندیی گشتی.

٤٣٠. عَنِ الْمِقْدَادِ بْنِ الْأَسْوَدِ ﷛ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ إِنْ لَقِيتُ رَجُلًا مِنَ الْكُفَّارِ، فَقَاتَلَنِي فَضَرَبَ إِحْدَى يَدَيَّ بِالسَّيْفِ، ثُمَّ لَاذَ مِنِّي بِشَجَرَةٍ، فَقَالَ: أَسْلَمْتُ

# كِتَابُ الْجَنَائِزِ

# پەرتووکی جەنازە

## بَابُ عِيَادَةِ النِّسَاءِ

## باسی سەردانکردنی ئافرەتی نەخۆش

٤٩٧. عَنْ أُمِّ الْعَلَاءِ ﵂ قَالَتْ: عَادَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا مَرِيضَةٌ، فَقَالَ: «أَبْشِرِي يَا أُمَّ الْعَلَاءِ، فَإِنَّ مَرَضَ الْمُسْلِمِ يُذْهِبُ اللَّهُ بِهِ خَطَايَاهُ، كَمَا تُذْهِبُ النَّارُ خَبَثَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ».

ئوم عەلاء ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی کردم من نەخۆش بووم، فەرمووی: «موژدە بێت ئەی دایکی عەلاء، مرۆڤی موسوڵمان کاتێك نەخۆش دەبێت بەهۆی نەخۆشییەکە خوا گوناهەکانی لێ هەڵدەوەرێنێت، هەروەکو چۆن ئاگر پیسی ئاڵتوون و زیو ناهێڵێت».

## بَابٌ فِي عِيَادَةِ الذِّمِّيِّ

### باسێك دەربارەی سەردانكردنی خاوەن پەیمانەكان

٤٩٨. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ غُلَامًا مِنَ الْيَهُودِ كَانَ مَرِضَ فَأَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُهُ فَقَعَدَ عِنْدَ رَأْسِهِ، فَقَالَ لَهُ: أَسْلِمْ فَنَظَرَ إِلَى أَبِيهِ، وَهُوَ عِنْدَ رَأْسِهِ، فَقَالَ لَهُ أَبُوهُ: أَطِعْ أَبَا الْقَاسِمِ فَأَسْلَمَ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ، وَهُوَ يَقُولُ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنْقَذَهُ بِي مِنَ النَّارِ».

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: گەنجێك لە جوولەكان نەخۆش بوو، پێغەمبەر ﷺ هات سەردانی كرد، لەلای سەری دانیشت، پێی فەرموو: موسوڵمان بە، ئەویش تەماشای باوكی كرد، باوكی لەلای سەریەوە بوو، باوكی پێی گوت: بە قسەی ئەبولقاسیم (پێغەمبەری خوا) بكە، ئەویش موسوڵمان بوو (شایەتمانی هێنا)، پێغەمبەر ﷺ هەڵسا دەیفەرموو: «سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە بەهۆی منەوە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری كرد».

## بَابٌ فِي الْعِيَادَةِ مِرَارًا

### باسێك دەربارەی چەندین جار سەردانكردنی نەخۆش

٤٩٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَمَّا أُصِيبَ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ يَوْمَ الْخَنْدَقِ، رَمَاهُ رَجُلٌ فِي الْأَكْحَلِ فَضَرَبَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَيْمَةً فِي الْمَسْجِدِ لِيَعُودَهُ مِنْ قَرِيبٍ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: سەعدی كوڕی موعاز ﵁ لە غەزای خەندەقدا (غەزای ئەحزابیشی پێ دەگوترێت) بریندار بوو، پیاوێك لە هاوبەشدانەران تیرێكی تێگرت دای لە دەمارێك لە نێوەڕاستی باڵیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ خێمەیەكی بۆ هەڵدا لەنێو مزگەوتەكەدا بۆ ئەوەی لە نزیكەوە سەردانی بكات.

## بَابُ الْخُرُوجِ مِنَ الطَّاعُونِ

### باسی دەرچوون (لە شوێن و وڵات) بەهۆی تاعوونەوە

٥٠٠. عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﵁: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِذَا سَمِعْتُمْ بِهِ بِأَرْضٍ، فَلَا تُقْدِمُوا عَلَيْهِ، وَإِذَا وَقَعَ بِأَرْضٍ وَأَنْتُمْ بِهَا فَلَا تَخْرُجُوا فِرَارًا مِنْهُ». يَعْنِي الطَّاعُونَ.

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﵁ (دەڵێت): گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «ئەگەر بیستتان (تاعوون) لە زەوییەکدا (لە شارێکدا) بڵاوبۆتەوە، مەچنە ئەو شارەوە، ئەگەر لە شوێنیکیش بوون تێیدا بڵاو بووەوە لێی دەرمەچن». (ئەبو داود دەڵێت: فەرموودەکە) مەبەست پێی تاعوونە.

## بَابُ الدُّعَاءِ لِلْمَرِيضِ بِالشِّفَاءِ عِنْدَ الْعِيَادَةِ

### باسی دوعاکردن بۆ نەخۆش کە خوا شیفای بدات لە کاتی سەرداندا

٥٠١. عَنْ عَائِشَةَ بِنْتِ سَعْدٍ: أَنَّ أَبَاهَا ﵁ قَالَ: اشْتَكَيْتُ بِمَكَّةَ فَجَاءَنِي النَّبِيُّ ﷺ يَعُودُنِي، وَوَضَعَ يَدَهُ عَلَى جَبْهَتِي، ثُمَّ مَسَحَ صَدْرِي وَبَطْنِي، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ اشْفِ سَعْدًا وَأَتْمِمْ لَهُ هِجْرَتَهُ».

عائیشەی کچی سەعد دەگێڕێتەوە: باوکی ﵁ (واتە: سەعد) گوتوویەتی: لە مەککە نەخۆش کەوتم، پێغەمبەر ﷺ هات سەردانی کردم، دەستی خستە نێوچاوانم، پاشان دەستی هێنا بە سنگ و سکمدا، پاشان فەرمووی: «خوایە شیفای سەعد بدە و کۆچەکەی بۆ تەواو بکە».

تێبینی:

لەبەر ئەوەی ئەوانەی کە لە مەککە کۆچیان کرد بۆ مەدینە، پاشان لە فەتحی مەککە هاتنەوە پێیانخۆش نەبوو لە مەککەدا وەفات بکەن، لەبەر ئەوەی لە مەککە کۆچیان کردبوو لەبەر خوای گەورە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ کرد کۆچکردنەکەی تەواو بکات، دوعاکەی قبوول بوو، دواتر سەعد رضي الله عنه گەڕایەوە بۆ مەدینە و لەوێ کۆچی دوایی کرد.

٥٠٢. عَنْ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَطْعِمُوا الْجَائِعَ، وَعُودُوا الْمَرِيضَ، وَفُكُّوا الْعَانِيَ». قَالَ سُفْيَانُ: وَالْعَانِي الْأَسِيرُ.

ئەبو مووسای ئەشعەری رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خواردن بە برسی بدەن و سەردانی نەخۆش بکەن و بەندە ڕزگار بکەن»، سوفیان دەڵێت: عانی، واتە: بەند، دیل، دەستبەسەرکراو.



## بَابُ الدُّعَاءِ لِلْمَرِيضِ عِنْدَ الْعِيَادَةِ

## باسی دوعاکردن بۆ نەخۆش لە کاتی سەردانکردندا

٥٠٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ عَادَ مَرِيضًا، لَمْ يَحْضُرْ أَجَلُهُ فَقَالَ عِنْدَهُ سَبْعَ مِرَارٍ: أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ، إِلَّا عَافَاهُ اللَّهُ مِنْ ذَلِكَ الْمَرَضِ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «کەسێك سەردانی نەخۆشێك بکات ئەو نەخۆشە ئەجەلی نەهاتبێت، حەوت جار ئەم دوعایەی بەسەردا بخوێنێت: (أَسْأَلُ اللَّهَ الْعَظِيمَ رَبَّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ أَنْ يَشْفِيَكَ)، واتە: داواکارم لە خوای گەورە، پەروەردگاری عەرشی گەورە شیفات بدات، بێگومان خوا لەو

نەخۆشییە شیفای دەدات (مادام ئەجەلی نەهاتبێت)».

٥٠٤. عَنِ ابْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا جَاءَ الرَّجُلُ يَعُودُ مَرِيضًا، فَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ اشْفِ عَبْدَكَ يَنْكَأُ لَكَ عَدُوًّا، أَوْ يَمْشِي لَكَ إِلَى جَنَازَةٍ». قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَقَالَ ابْنُ السَّرْحِ: إِلَى صَلَاةٍ.

ئیبن عەمر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر کەسێك سەردانی نەخۆشێکی کرد با ئەم نزایەی بۆ بکات: خوایە شیفای ئەم بەندەیەت بدەی، لەپێناوی تۆدا دوژمن بریندار دەکات و لەگەڵی دەجەنگێت، یان لەپێناوی تۆدا دوای جەنازەیەك دەکەوێت»، ئەبو داود دەڵێت: ئیبن سەڕح گوتی: یان دەچێت بۆ نوێژ.

## بَابُ فِي كَرَاهِيَةِ تَمَنِّي الْمَوْتِ

### باسێك دەربارەی ناپەسندی و خراپی خۆزگەخوازی بۆ مردن

٥٠٥. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَدْعُوَنَّ أَحَدُكُمْ بِالْمَوْتِ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، وَلَكِنْ لِيَقُلْ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الْحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الْوَفَاةُ خَيْرًا لِي».

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کەسێك تووشی زیانێك بوو با ئاوات نەخوازێت بۆ مردن (نەڵێت: خوایە لەناوم بەریت)، بەڵکوو با بڵێت: خوایە تا ژیان خێری بۆ من تێدایە بمژیێنیت، ئەگەر مردنیش خێری بۆ من تێدایە خوایە بممرێنیت».

٥٠٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ». فَذَكَرَ مِثْلَهُ.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «با یەکێك لە ئێوە ئاوات نەخوازێت بە مردن (ئەگەر هەر ناچار بووی ئەم نزایە بکە کە لە فەرموودەی پێشوو هاتووە)». پاشان هاوشێوەی فەرموودەکەی پێشووی باس کرد.

## بَابُ مَوْتُ الْفَجْأَةِ

### باسی مردنی کتوپڕ و لەناکاو

٥٠٧. عَنْ عُبَيْدِ بْنِ خَالِدٍ السُّلَمِيِّ، رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ مَرَّةً: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ قَالَ مَرَّةً: عَنْ عُبَيْدٍ، قَالَ: «مَوْتُ الْفَجْأَةِ أَخْذَةُ أَسَفٍ».

عوبەیدی کوڕی خالیدی سولەمی، پیاوێك بووە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ جارێك دەڵێت: لە پێغەمبەرەوە ﷺ، پاشان جارێك دەڵێت: لە عوبەیدەوە، فەرموویەتی: «مردنی لەناکاو و کتوپڕ جێگەی تووڕەبوونی خوایە (بۆ کەسی بێبڕوا)».



## بَابُ مَا يُسْتَحَبُّ مِنْ حُسْنِ الظَّنِّ بِاللَّهِ عِنْدَ الْمَوْتِ

### باسی ئەوەی کە لە کاتی مردندا گومانی چاك بە خوا بردن سوننەتە

٥٠٨. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ قَبْلَ مَوْتِهِ بِثَلَاثٍ: قَالَ: «لَا يَمُوتُ أَحَدُكُمْ إِلَّا وَهُوَ يُحْسِنُ الظَّنَّ بِاللَّهِ».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ سێ ڕۆژ پێش مردنەکەی فەرمووی: «هیچ کەسێك لە ئێوە نەمرێت مەگەر با حاڵی وا بێت کە گومانی باش بە خوا ببات».

## بَابُ مَا يُسْتَحَبُّ مِنْ تَطْهِيرِ ثِيَابِ الْمَيِّتِ عِنْدَ الْمَوْتِ

## باسی ئەوەی کە پاکڕاگرتنی پۆشاکی کەسێك کە نزیکی مردنە سوننەتە

٥٠٩. **عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ** ﷺ: **أَنَّهُ لَمَّا حَضَرَهُ الْمَوْتُ، دَعَا بِثِيَابٍ جُدُدٍ فَلَبِسَهَا، ثُمَّ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ:** «إِنَّ الْمَيِّتَ يُبْعَثُ فِي ثِيَابِهِ الَّتِي يَمُوتُ فِيهَا».

لە ئەبو سەعیدی خودریبەوە ﷺ دەگێڕنەوە: کاتێك لە سەرەمەرگدا بوو، داوای پۆشاکی نوێی کرد و پۆشیی، پاشان گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «مردوو لەو پۆشاکەدا زیندوو دەکرێتەوە کە تێیدا دەمرێت».

## بَابُ مَا يُسْتَحَبُّ أَنْ يُقَالَ عِنْدَ الْمَيِّتِ مِنَ الْكَلَامِ

## باسی ئەوەی سوننەتە بگوترێت لەلای مردوو

٥١٠. **عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ** ﷺ **قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:** «إِذَا حَضَرْتُمُ الْمَيِّتَ فَقُولُوا خَيْرًا، فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ»، **فَلَمَّا مَاتَ أَبُو سَلَمَةَ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا أَقُولُ؟ قَالَ:** «قُولِي اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَأَعْقِبْنَا عُقْبَى صَالِحَةً»، **قَالَتْ: فَأَعْقَبَنِي اللَّهُ تَعَالَى بِهِ مُحَمَّدًا ﷺ.**

ئوم سەلەمە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر ئامادە بوون لای کەسێك کە نزیکە دەمرێت، ئێوە قسەی باش بکەن (واتە: دوعای بۆ بکەن بە لێخۆشبوون)، چونکە فریشتەکان ئامین دەکەن لەسەر ئەو قسانەی ئێوە کە دەیکەن»، جا کاتێك ئەبو سەلەمە (ی هاوسەرم) کۆچی دوایی کرد، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، چی بڵێم؟ فەرمووی: «بڵێ خوایە لە ئەبو سەلەمە خۆش بە و بە کەسێکی باشتر

لە ئەبو سەلەمە بۆم قەرەبوو بکەرەوە و جێی بگرێتەوە»، دەڵێت: ئەم دوعایەم کرد، خوا بە موحەممەد پێغەمبەری خوا ﷺ جێی ئەبو سەلەمەی بۆ گرتمەوە.

## بَابُ فِي التَّلْقِينِ

### باسێك دەربارەی چرپاندن بە گوێدا

٥١١. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ كَانَ آخِرُ كَلَامِهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ».

موعازی کوڕی جەبەل رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك (پێش مردن) دوا وشەی (لا إله إلا الله) بێت، ئەوە دەچێتە بەهەشتەوە».

٥١٢. عن أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ رضي الله عنه يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ قَوْلَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ».

ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «تەلْقینی ئەو کەسانە بکەن لە سەرەمەرگدان بە وشەی (لا إله إلا الله)».

٥١٣. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى أَبِي سَلَمَةَ، وَقَدْ شَقَّ بَصَرَهُ، فَأَغْمَضَهُ، فَصَيَّحَ نَاسٌ مِنْ أَهْلِهِ، فَقَالَ: «لَا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ إِلَّا بِخَيْرٍ، فَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ يُؤَمِّنُونَ عَلَى مَا تَقُولُونَ»، ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِأَبِي سَلَمَةَ وَارْفَعْ دَرَجَتَهُ فِي الْمَهْدِيِّينَ، وَاخْلُفْهُ فِي عَقِبِهِ فِي الْغَابِرِينَ، وَاغْفِرْ لَنَا وَلَهُ رَبَّ الْعَالَمِينَ، اللَّهُمَّ افْسَحْ لَهُ فِي قَبْرِهِ، وَنَوِّرْ لَهُ فِيهِ». قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَتَغْمِيضُ الْمَيِّتِ بَعْدَ خُرُوجِ الرُّوحِ، سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ مُحَمَّدِ بْنِ النُّعْمَانِ الْمُقْرِيَّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا مَيْسَرَةَ رَجُلًا عَابِدًا يَقُولُ: غَمَّضْتُ جَعْفَرًا الْمُعَلِّمَ وَكَانَ رَجُلًا عَابِدًا فِي حَالَةِ الْمَوْتِ، فَرَأَيْتُهُ فِي

مَنَامِي لَيْلَةَ مَاتَ، يَقُولُ: أَعْظَمُ مَا كَانَ عَلَيَّ تَغْمِيضُكَ لِي قَبْلَ أَنْ أَمُوتَ.

ئوم سەلەمە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ هات بۆلای ئەبو سەلەمە دوای مردن چاوی کرابوویەوە، چاوی (مردووەکەی) داخست، خزم و کەسی هاواریان کرد، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «تەنها دوعای چاکە بۆ خۆتان بکەن، چونکە فریشتەکان ئامین دەکەن لە کاتی ئەو دوعایانەی ئێوەدا»، پاشان فەرمووی: «خوایە لە ئەبو سەلەمە خۆش بیت، پلەی بەرز بکەرەوە لەنێو ئەو کەسانەی کە هیدایەتت داون بۆ ئیسلام (ئەوانەی سەرەتاکان)، وە جێگای بۆ پڕ بکەرەوە خوایە لە ئێمە و لەویش خۆش بە، خوایە گۆڕەکەی بۆ فراوان و ڕووناك بکەرەوە». ئەبو داود دەڵێت: نوقاندنی چاوی مردوو لەدوای دەرچوونی ڕووح، (دەڵێت:) گوێم لە موحەممەدی کوڕی موحەممەدی کوڕی نوعمانی موقری بوو، گوتی: گوێم لە ئەبو مەیسەرە بوو پیاوێکی خواپەرست بوو دەیگوت: لە کاتی مردندا چاوەکانی جەعفەری موعەللیمم داخست کە پیاوێکی خواپەرست بوو، ئیدی لە خەودا بینیم ئەو شەوەی کە مرد گوتی: گەورەترین شت بەسەرمەوە ئەوەیە کە پێش ئەوەی بمرم چاومت نوقاند.

## بَابٌ فِي الِاسْتِرْجَاعِ

### باسێك دەربارەی گوتنی: (إنا لله وإنا إليه راجعون) لە کاتی ناخۆشیدا

٥١٤. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَصَابَتْ أَحَدَكُمْ مُصِيبَةٌ فَلْيَقُلْ: إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ، اللَّهُمَّ عِنْدَكَ أَحْتَسِبُ مُصِيبَتِي، فَآجِرْنِي فِيهَا، وَأَبْدِلْ لِي بِهَا خَيْرًا مِنْهَا».

ئوم سەلەمە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێك لە ئێوە

تووشی بەڵایەك بوو، با بڵێت: بێگومان ئێمە هەموومان موڵکی خواین و بێگومان هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە، خوایە من لەو بەڵایە چاوەڕێی پاداشت لە تۆ دەکەم، پاداشتم بدەوە و بە لەوەش باشتر بۆم قەرەبوو بکەوە».

## بَابُ الصَّبْرِ عِنْدَ الصَّدْمَةِ

### باسی ئەوەی کە ئارامگری لە سەرەتای ناخۆشییەکەدایە

٥١٥. عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: أَتَى نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ عَلَى امْرَأَةٍ تَبْكِي عَلَى صَبِيٍّ لَهَا، فَقَالَ لَهَا: «اتَّقِي اللَّهَ، وَاصْبِرِي»، فَقَالَتْ: وَمَا تُبَالِي أَنْتَ بِمُصِيبَتِي، فَقِيلَ لَهَا: هَذَا النَّبِيُّ ﷺ، فَأَتَتْهُ، فَلَمْ تَجِدْ عَلَى بَابِهِ بَوَّابِينَ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، لَمْ أَعْرِفْكَ، فَقَالَ: «إِنَّمَا الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الْأُولَى -أَوْ: عِنْدَ أَوَّلِ صَدْمَةٍ-».

ئەنەس رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر گۆڕستان ئافرەتێك دەبینێت منداڵێکی مردبوو، پێی فەرمووو: پارێز لە خوا بکە و ئارام بگرە، گوتی: تۆ گرینگی نادەیت بە بەڵای من (پێغەمبەری خوای ﷺ نەناسی)، گوتیان: ئەوە پێغەمبەرە ﷺ، (پێغەمبەر ﷺ کە گەڕایەوە بۆ ماڵ) ئافرەتەکەش هات بۆ ماڵ، لای دەرگا دەرگاوانی نەبینی، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆم نەناسی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەو ئارامییەی کە پاداشتە گەورەکەی لەسەرە لە کاتی یەکەم ساتی لێقەوماندایە».

## بَابٌ فِي الْبُكَاءِ عَلَى الْمَيِّتِ

### باسێك دەربارەی گریان لەسەر مردوو

٥١٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وُلِدَ لِي اللَّيْلَةَ غُلَامٌ فَسَمَّيْتُهُ

بِاسْمِ أَبِي إِبْرَاهِيمَ» - فَذَكَرَ الْحَدِيثَ - قَالَ أَنَسٌ: لَقَدْ رَأَيْتُهُ يَكِيدُ بِنَفْسِهِ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَدَمَعَتْ عَيْنَا رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «تَدْمَعُ الْعَيْنُ وَيَحْزَنُ الْقَلْبُ، وَلَا نَقُولُ إِلَّا مَا يُرْضِي رَبَّنَا، إِنَّا بِكَ يَا إِبْرَاهِيمُ لَمَحْزُونُونَ».

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەمشەو منداڵێکمان بوو بە ناوی ئیبراهیمی باوکمەوە ناوم لێ نا ئیبراهیم، فەرموودەکە باس دەکات، ئەنەس ﷺ دەڵێت: بینیم ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ لە سەرەمەرگدا بوو، لەبەر دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ، فرمێسك بە چاوەکانی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەهاتە خوارەوە، فەرمووی: «چاو فرمێسك دەڕێژێت، دڵ خەفەتبار دەبێت، بەڵام هیچ قسەیەك ناکەین تەنها ئەوە نەبێت خوا لێمان ڕازی بێت، ئێمە (بە جیابوونەوەی تۆ) ئەی ئیبراهیم خەفەتبارین».



## بَابٌ فِي النَّوْحِ

### باسێك دەربارەی شین و ڕۆڕۆکردن

٥١٧. عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂ قَالَتْ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَانَا عَنِ النِّيَاحَةِ.

ئوم عەتییە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی لێ کردین لە شیوەن و بەرزکردنەوەی دەنگ و باسکردنی مردووەکە.

## بَابٌ فِي الشَّهِيدِ يُغَسَّلُ

### باسێك دەربارەی شوشتنی شەهید

٥١٨. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَجْمَعُ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ مِنْ

قَتْلَى أُحُدٍ وَيَقُولُ: «أَيُّهُمَا أَكْثَرُ أَخْذًا لِلْقُرْآنِ؟»، فَإِذَا أُشِيرَ لَهُ إِلَى أَحَدِهِمَا، قَدَّمَهُ فِي اللَّحْدِ، وَقَالَ: «أَنَا شَهِيدٌ عَلَى هَؤُلَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، وَأَمَرَ بِدَفْنِهِمْ بِدِمَائِهِمْ، وَلَمْ يُغَسَّلُوا.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دوو پیاوی لە کوژراوانی ئوحود لە یەك گۆڕدا دەناشت، دەیفەرموو: کامیان قورئانی زیاتر لەبەرە ئەویان لەپێشدا بنێژن، کە ئاماژەیان بدایە فلان کەس لەوی دیکەیان زیاتری لەبەرە، لەنێو گۆڕەکەدا پێشی دەخست، فەرمووی: «من شایەتی بۆ ئەوانە دەدەم لە ڕۆژی قیامەت»، ئینجا فەرمانی کرد بە خوێنەکانیانەوە بنێژرێن و نەشۆردران.

## بَابٌ فِي الْكَفَنِ

### باسێك دەربارەی (چۆنیەتی) کفن

٥١٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: أُدْرِجَ النَّبِيُّ ﷺ فِي ثَوْبِ حِبَرَةٍ ثُمَّ أُخِّرَ عَنْهُ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: (کاتێك پێغەمبەریان ﷺ شوشت) عەبایەکی یەمەنی تێوە پێچرا، پاشان لایانبرد و لێیان کردەوە (بە قوماشی دیکە کفن کرا).

٥٢٠. عن عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كُفِّنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي ثَلَاثَةِ أَثْوَابٍ يَمَانِيَةٍ بِيضٍ، لَيْسَ فِيهَا قَمِيصٌ وَلَا عِمَامَةٌ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کفن کرا لە سێ پارچە پۆشاکی یەمەنی سپیدا، نە قەمیصی بۆ دانرا، نە مێزەر.

## بَابٌ فِي تَقْبِيلِ الْمَيِّتِ

## باسێك دەربارەی ماچكردنی مردوو

٥٢١. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُقَبِّلُ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ وَهُوَ مَيِّتٌ، حَتَّى رَأَيْتُ الدُّمُوعَ تَسِيلُ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی عوسمانی كوڕی مەزعونی ماچ كرد كە مردبوو (برای شیری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو)، تەنانەت بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ فرمێسكەكانی بە چاویدا دەهاتنە خوارەوە.

## بَابٌ فِي الْمَيِّتِ يُحْمَلُ مِنْ أَرْضٍ إِلَى أَرْضٍ وَكَرَاهَةِ ذَلِكَ

## باسێك دەربارەی ناپەسندی گواستنەوەی مردوو لە شارێك بۆ شارێكی دیكە

٥٢٢. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: كُنَّا حَمَلْنَا الْقَتْلَى يَوْمَ أُحُدٍ لِنَدْفِنَهُمْ، فَجَاءَ مُنَادِي النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تَدْفِنُوا الْقَتْلَى فِي مَضَاجِعِهِمْ، فَرَدَدْنَاهُمْ.

جابیری كوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەڵێت: ئێمە شەهیدانی ئوحودمان هەڵگرت بۆ ئەوەی بیانگوازینەوە و بیاننێژین، بانگكەری پێغەمبەر ﷺ هات گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانتان پێ دەكات كوژراوان لە كوێ شەهید بوونە لە شوێنی خۆیاندا بیاننێژن، ئێمەش ئەوانمان گەڕاندەوە.

## بَابُ اتِّبَاعِ النِّسَاءِ الْجَنَائِزَ

### باسێك دەربارەی ڕۆیشتنی ئافرەتان بەشوێن جەنازەدا

٥٢٣. عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂ قَالَتْ: نُهِينَا أَنْ نَتَّبِعَ الْجَنَائِزَ، وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا.

ئوم عەتییە ﵂ دەڵێت: ئێمە لێیان قەدەغە کرابوو کە شوێن جەنازە بکەوین، بەڵام تۆبزییان لێ نەدەکرا.

## بَابُ فَضْلِ الصَّلَاةِ عَلَى الْجَنَائِزِ وَتَشْيِيعِهَا

### باسی فەزڵی نوێژکردن لەسەر جەنازەو شاردنەوەی

٥٢٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ فَيَقُومُ عَلَى جَنَازَتِهِ أَرْبَعُونَ رَجُلًا، لَا يُشْرِكُونَ بِاللَّهِ شَيْئًا، إِلَّا شُفِّعُوا فِيهِ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: «هیچ موسوڵمانێك نییە بمرێت و چل کەس لەسەری نوێژ بکەن کە هاوبەشیان بۆ خوا دانەنابێت، بێگومان خوا تکا و دوعایان بۆی وەردەگرێت».

## بَابُ الْقِيَامِ لِلْجَنَازَةِ

### باسی هەڵسان لەبەر جەنازە

٥٢٥. عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ ﵁ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ ﷺ: «إِذَا رَأَيْتُمُ الْجَنَازَةَ فَقُومُوا لَهَا، حَتَّى تُخَلِّفَكُمْ أَوْ تُوضَعَ».

عامیری کوڕی ڕەبیعە ﷺ فەرموودەکە بەرز دەکاتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر جەنازەیەکتان بینی هەڵسن لەبەری تا جەنازەکە تێدەپەڕێت و ئێوە بەجێ دێڵێت، یان ئەگەر لەگەڵیدا بوون تا دادەنرێت لە زەوییەکە (واتە: بەپێوە بن و دامەنیشن)».

## بَابُ الرُّكُوبِ فِي الْجَنَازَةِ

## باسی شوێنکەوتنی جەنازە بەسواری

٥٢٦. عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، أُتِيَ بِدَابَّةٍ وَهُوَ مَعَ الْجَنَازَةِ فَأَبَى أَنْ يَرْكَبَهَا، فَلَمَّا انْصَرَفَ أُتِيَ بِدَابَّةٍ فَرَكِبَ، فَقِيلَ لَهُ، فَقَالَ: «إِنَّ الْمَلَائِكَةَ كَانَتْ تَمْشِي، فَلَمْ أَكُنْ لِأَرْكَبَ وَهُمْ يَمْشُونَ، فَلَمَّا ذَهَبُوا رَكِبْتُ».

سەوبان ﷺ دەگێڕێتەوە: (وڵاخێکیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا)، پێغەمبەری خوا ﷺ دوای جەنازەیەك کەوتبوو ڕەتی کردەوە سوار وڵاخەکە ببێت، پاشان لە گەڕانەوەدا وڵاخێکیان بۆی هێنا سوار بوو، پێی گوترا (بۆ سەرەتا سەر نەکەوتیت، ئێستا لە گەڕانەوەدا سەر دەکەویت؟)، فەرمووی: «لەبەر ئەوەی فریشتەکان بەپێ دوای جەنازەکە کەوتبوون، نەدەبوایە من سوار (ئەسپێك یان مایینێك) بم ئەوانیش بەپێ بڕۆن، پاشان لە گەڕانەوەدا کە ئەوان ڕۆیشتن ئینجا منیش سوار بووم».

## بَابُ الْمَشْيِ أَمَامَ الْجَنَازَةِ

## باسی ڕۆیشتن لە پێش جەنازەوە بەپێ

٥٢٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ ﷺ يَمْشُونَ أَمَامَ الْجَنَازَةِ.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەكر و عومەریشم ﵄ بینیوە لەپێش جەنازەوە ڕۆیشتوونە.

## بَابُ الْإِسْرَاعِ بِالْجَنَازَةِ

### باسی پەلەكردن لە بردنی جەنازەدا

٥٢٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَسْرِعُوا بِالْجَنَازَةِ فَإِنْ تَكُ صَالِحَةً فَخَيْرٌ تُقَدِّمُونَهَا إِلَيْهِ، وَإِنْ تَكُ سِوَى ذَلِكَ فَشَرٌّ تَضَعُونَهُ عَنْ رِقَابِكُمْ».

ئەبو هوڕەیڕە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «خێرا جەنازە هەڵبگرن و بیبەن بۆ گۆڕستان، ئەگەر ئەم جەنازەیە كەسێكی چاك بێت، ئەوە باشترین شتە كە پێشكەشی دەكەن و دەیگەیەنن بە شوێنی خۆی، ئەگەر واش نەبێت كەسێكی خراپ بێت، ئەوە خراپەیەكە لەكۆڵ خۆتانی دەكەنەوە».

## بَابُ الدَّفْنِ عِنْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَعِنْدَ غُرُوبِهَا

### باسی ناشتنی مردوو لە سەرەتای خۆرهەڵاتن و كاتی خۆرئاوابوون

٥٢٩. عَنْ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ ﵁ قَالَ: ثَلَاثُ سَاعَاتٍ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَنْهَانَا أَنْ نُصَلِّيَ فِيهِنَّ، أَوْ نَقْبُرَ فِيهِنَّ مَوْتَانَا: حِينَ تَطْلُعُ الشَّمْسُ بَازِغَةً حَتَّى تَرْتَفِعَ، وَحِينَ يَقُومُ قَائِمُ الظَّهِيرَةِ حَتَّى تَمِيلَ، وَحِينَ تَضَيَّفُ الشَّمْسُ لِلْغُرُوبِ حَتَّى تَغْرُبَ أَوْ كَمَا، قَالَ.

عوقبەی كوڕی عامیر ﵁ دەڵێت: سێ كات هەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی دەكردین نوێژی تێدا بكەین، یان مردووەكانمانی تێدا بنێژین: سەرەتای خۆر

دەركەوتن چاوەڕێ بكرێت تا تەواو بەرز دەبێتەوە، كاتێك خۆر لە نێوەڕاستی ئاسماندا لە نیوەڕۆ ڕادەوەستێت، كاتێك كە خۆر لار دەبێتەوە بۆ ئاوابوون، یان بەم شێوازەی كە فەرموویەتی.

## بَابٌ إِذَا حَضَرَ جَنَائِزُ رِجَالٍ وَنِسَاءٍ مَنْ يُقَدَّمُ؟

## باسێك: ئەگەر جەنازەی كۆمەڵێك ژن و پیاو دانرا بۆ نوێژ لەسەركردن، كامیان پێش دەخرێت؟

٥٣٠. عَنْ يَحْيَى بْنِ صَبِيحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمَّارٌ، مَوْلَى الْحَارِثِ بْنِ نَوْفَلٍ، أَنَّهُ شَهِدَ جَنَازَةَ أُمِّ كُلْثُومٍ، وَابْنِهَا، فَجُعِلَ الْغُلَامُ مِمَّا يَلِي الْإِمَامَ، فَأَنْكَرْتُ ذَلِكَ، وَفِي الْقَوْمِ ابْنُ عَبَّاسٍ، وَأَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ، وَأَبُو قَتَادَةَ، وَأَبُو هُرَيْرَةَ، فَقَالُوا: «هَذِهِ السُّنَّةُ».

یەحیای كوڕی صوبەیح دەڵێت: عەممای خزمەتكاری حاریسی كوڕی نەوفەل، بۆی گێڕامەوە (و گوتی): ئامادەی نوێژی ئوم كولسوم بوو لەگەڵ كوڕەكەیدا[1]، كوڕەكە لەلای ئیمامەوە دادەنرێت، ئافرەتەكە لەلای قیبلەوە دادەنرێت، دەڵێت: نكووڵی ئەو شتەم كرد، لەنێو قەومەكەدا ئیبن عەبباس و ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو قەتادە و ئەبو هورەیرەی تیادا بوو، گوتیان: ئەمە سوننەتە.

تێبینی:

بەم شێوازە كە ئەگەر ژن و پیاوێك بوو، یان منداڵێكی كوڕ لەگەڵ ئافرەتێكدا بوو، منداڵەكە لەلای ئیمامەوە دادەنرێت و ئافرەتەكە لەلای قیبلەوە دادەنرێت، وە ڕیوایەتی دیكە هاتووە لە ئیبن عومەرەوە نوێژی لەسەر حەوت جەنازە كردووە

.................................

(١) كە ناوی زەیدی ئەكبەر بوو كوڕی پێشەوا عومەر بوو، ئەم ئوم كولسومە كچی پێشەوا عەلییە، خێزانی پێشەوا عومەرە، پێشەوا عومەر زاوای پێشەوا عەلی بووە، لەگەڵ كوڕەكەیدا هەردووكیان بەیەكەوە لە یەك كاتدا مردن، هەتا نەیانزانی كامیان پێش كامیان مردوونە، بۆیە كەسیان میراتیان لە كەسیان نەبرد.

کە ژن و پیاو بوونە، پیاوەکانی لەلای ئیمامەوە داناوە، وە ژنەکانی لەلای قیبلەوە داناوە، وە بە یەك ڕیز ڕێکی خستوون، وە نوێژی لەسەر کردوون، کەواتە دروستە هەمووی بەیەکەوە یەك نوێژی لەسەر بکەیت، وە دەگوترێت: دروستیشە یەك یەك نوێژیان لەسەر بکەیت، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر کوژراوانی ئوحود یەك یەك نوێژی لەسەر کردوون، یان گوتراوە: دە دە دایناون و نوێژی لەسەر کردوون، وە پێشەوا عوسمان و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و ئەبو هوڕەیرەش لە مەدینەدا ژن و پیاو بمردنایە بەیەکەوە نوێژیان لەسەر دەکردن، پیاوەکانیان لەلای ئیمامەوە دادەنا، ئافرەتەکان لەلای قیبلەوە.

## بَابُ أَيْنَ يَقُومُ الْإِمَامُ مِنَ الْمَيِّتِ إِذَا صَلَّى عَلَيْهِ؟

## باسی ئیمام کە نوێژی لەسەر مردوو کرد لەکوێوە ڕادەوەستێت؟

٥٣١. عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدُبٍ رضي الله عنه قَالَ: صَلَّيْتُ وَرَاءَ النَّبِيِّ ﷺ عَلَى امْرَأَةٍ مَاتَتْ فِي نِفَاسِهَا، فَقَامَ عَلَيْهَا لِلصَّلَاةِ وَسَطَهَا.

سەموڕەی کوڕی جوندوب رضي الله عنه دەڵێت: ئافرەتێك بەسەر منداڵێکەوە کۆچی دوایی کرد لە زەیستانیدا، نوێژم لەسەری کرد لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، پێغەمبەر ﷺ لە نێوەڕاستی ئافرەتەکە ڕاوەستا.

## بَابُ مَا يَقْرَأُ عَلَى الْجَنَازَةِ

## باسی چ شتێك لەسەر جەنازە دەخوێندرێت؟

٥٣٢. عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَوْفٍ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عَلَى جَنَازَةٍ،

فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ، فَقَالَ: إِنَّهَا مِنَ السُّنَّةِ.

تەلحەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەوف دەڵێت: لەگەڵ ئیبن عەبباس ﷺ لەسەر جەنازەیەك نوێژمان کرد، فاتیحەی خوێند، گوتی: ئەمە سوننەتە.

## بَابُ الدُّعَاءِ لِلْمَيِّتِ

### باسی دوعاکردن بۆ مردوو

٥٣٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى جَنَازَةٍ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا، وَمَيِّتِنَا، وَصَغِيرِنَا، وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا، وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا، اللَّهُمَّ مَنْ أَحْيَيْتَهُ مِنَّا فَأَحْيِهِ عَلَى الْإِيمَانِ، وَمَنْ تَوَفَّيْتَهُ مِنَّا فَتَوَفَّهُ عَلَى الْإِسْلَامِ، اللَّهُمَّ لَا تَحْرِمْنَا أَجْرَهُ، وَلَا تُضِلَّنَا بَعْدَهُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر جەنازەیەك نوێژی کرد، فەرمووی: «خوایە لە زیندوو و مردوومان خۆش بیت و لە بچووك و گەورەمان خۆش بیت و لە نێر و مێیان خۆش بە، لەوەی ئامادەیە و لەوەی لێرە نییە، خوایە ئەوەی ژیاندت لە ئێمە لەسەر ئیمان بیژیێنیت و ئەوەیشی کە مراندت لە ئێمە لەسەر ئیسلام بیمرێنیت، خوایە لە پاداشتی نوێژکردن لەسەر ئەو جەنازەیە بێبەشمان نەکەیت، لە دوای ئەویش گومڕامان نەکەیت».

## بَابُ الصَّلَاةِ عَلَى الْقَبْرِ

### باسی نوێژکردن لەسەر گۆڕ

٥٣٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ امْرَأَةً سَوْدَاءَ - أَوْ رَجُلًا - كَانَ يَقُمُّ الْمَسْجِدَ، فَفَقَدَهُ

النَّبِيُّ ﷺ فَسَأَلَ عَنْهُ، فَقِيلَ: مَاتَ، فَقَالَ: «أَلَا آذَنْتُمُونِي بِهِ؟»، قَالَ: «دُلُّونِي عَلَى قَبْرِهِ»، فَدَلُّوهُ، فَصَلَّى عَلَيْهِ.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێکی ڕەشپێست، یان پیاوێك، مزگەوتی پاك دەکردەوە (خزمەتی دەکرد)، پێغەمبەر ﷺ بینیی دیار نییە، پرسیاری کرد، گوترا: کۆچی دوایی کرد، فەرمووی: «ئەی بۆ منتان ئاگادار نەکردەوە (کە مردووە بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکەم)؟»، فەرمووی: «گۆڕەکەیم پێ نیشان بدەن»، نیشانیان دا، (پێغەمبەر ﷺ چوو لەسەر گۆڕەکەی) نوێژی لەسەر کرد.

## بَابٌ فِي الصَّلَاةِ عَلَى الْمُسْلِمِ يَمُوتُ فِي بِلَادِ الشِّرْكِ

### باسێك دەربارەی نوێژکردن لەسەر موسوڵمانێك کە لە وڵاتی کافران بمرێت

٥٣٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَعَى لِلنَّاسِ النَّجَاشِيَّ فِي الْيَوْمِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ، وَخَرَجَ بِهِمْ إِلَى الْمُصَلَّى، فَصَفَّ بِهِمْ، وَكَبَّرَ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەو ڕۆژەی نەجاشی کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی مردنەکەی بە خەڵك ڕاگەیاند، دەریکردن لەگەڵ خۆیدا بردنی بۆ نوێژگە (لە دەرەوەی شار)، ئەوانی کردە چەند پۆلێکەوە، (نوێژی غائیبی لەسەر نەجاشی کرد) چوار (الله أکبر)ی لەسەر کرد.

## بَابُ الْجُلُوسِ عِنْدَ الْقَبْرِ

### باسی دانیشتن لەلای گۆڕ (کە تازە هەڵکەندراوە و دانەپۆشراوە)

٥٣٦. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي جَنَازَةِ رَجُلٍ مِنَ

الْأَنْصَارِ فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَبْرِ، وَلَمْ يُلْحَدْ بَعْدُ فَجَلَسَ النَّبِيُّ ﷺ مُسْتَقْبِلَ الْقِبْلَةِ وَجَلَسْنَا مَعَهُ.

بەرائی کوڕی عازیب ﵁ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین بۆ جەنازەی پیاوێکی ئەنصاڕی، گەیشتینە لای گۆڕەکە، هێشتا لەحدەکەی لەلاوە بۆ چاڵ نەکرابوو، پێغەمبەر ﷺ ڕووەو قیبلە دانیشت ئێمەش لەگەڵیدا دانیشتین.

## بَابٌ فِي الدُّعَاءِ لِلْمَيِّتِ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ

### باسی دوعاکردن بۆ مردوو کاتێك دەخرێتە ناو گۆڕەکەیەوە

٥٣٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا وَضَعَ الْمَيِّتَ فِي الْقَبْرِ قَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە مردوو لەنێو گۆڕ دادەنرا، دەیفەرموو: «بە ناوی خوا و لەسەر سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەری خوا».

## بَابُ الِاسْتِغْفَارِ عِنْدَ الْقَبْرِ لِلْمَيِّتِ فِي وَقْتِ الِانْصِرَافِ

### باسی داوای لێخۆشبوونکردن بۆ مردوو کاتی گەڕانەوە (لەدوای ناشتن)

٥٣٨. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا فَرَغَ مِنْ دَفْنِ الْمَيِّتِ وَقَفَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: «اسْتَغْفِرُوا لِأَخِيكُمْ، وَسَلُوا لَهُ بِالتَّثْبِيتِ، فَإِنَّهُ الْآنَ يُسْأَلُ».

عوسمانی کوڕی عەففان ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ کاتێك لە ناشتنی مردووە دەبوویەوە لەلای گۆڕەکە ڕادەوەستا و دەیفەرموو: «داوای لێخۆشبوون بۆ براکەتان

بکەن، داوا بکەن لە خوا بۆ ئەوەی جێگیری بکات، لەبەر ئەوەی ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت (فریشتەکان دێن پرسیاری لێ دەکەن)».

## بَابُ كَرَاهِيَةِ الذَّبْحِ عِنْدَ الْقَبْرِ

## باسی ناپەسندی سەربڕینی ئاژەڵ لەلای گۆڕ

٥٣٩. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا عَقْرَ فِي الْإِسْلَامِ»، قَالَ عَبْدُ الرَّزَّاقِ: كَانُوا يَعْقِرُونَ عِنْدَ الْقَبْرِ بَقَرَةً أَوْ شَاةً.

ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سەربڕینی ئاژەڵ لەلای گۆڕ (عەقر) لە ئیسلامدا نییە»، عەبدوڕڕەزاق دەڵێت: مەبەستی ئەوەیە لە نەفامێتیدا لەلای گۆڕەکە ئاژەڵیان سەر دەبڕی، ئیدی مانگا بووایە یان مەڕ.

## بَابُ الْمَيِّتِ يُصَلَّى عَلَى قَبْرِهِ بَعْدَ حِينٍ

## باسی نوێژی مردوو لەسەر گۆڕەکەی لەدوای ماوەیەکی زۆر

٥٤٠. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ يَوْمًا فَصَلَّى عَلَى أَهْلِ أُحُدٍ، صَلَاتَهُ عَلَى الْمَيِّتِ، ثُمَّ انْصَرَفَ.

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێکیان دەرچوو بۆ لای ئەهلی ئوحود نوێژی لەسەر کردن، پاشان ڕۆیشت.

## بَابٌ فِي الْبِنَاءِ عَلَى الْقَبْرِ

### باسێك دەربارەی دروستکردنی خانوو لەسەر گۆڕ

٥٤١. عن جَابِرٍ ﵁ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى أَنْ يَقْعُدَ عَلَى الْقَبْرِ، وَأَنْ يُقَصَّصَ وَيُبْنَى عَلَيْهِ.

جابیر ﵁ دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی کرد لە دانیشتن لەسەر گۆڕ، ڕێگریشی کردووە هەڵبەستریت (واتە: گەچ بکرێت و هەڵبەسترێت)، قەدەغەی کردووە خانووشی لەسەر دروست بکرێت.

٥٤٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ اتَّخَذُوا قُبُورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا جوولەکە بکوژێت (یاخود نەفرەتی خوا لە جوولەکە بێت) لەبەر ئەوەی گۆڕی پێغەمبەرانیان کردووە بە مزگەوت».

## بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ الْقُعُودِ عَلَى الْقَبْرِ

### باسێك دەربارەی ناپەسندی (حەرامی) دانیشتن لەسەر گۆڕ

٥٤٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَأَنْ يَجْلِسَ أَحَدُكُمْ عَلَى جَمْرَةٍ فَتُحْرِقَ ثِيَابَهُ، حَتَّى تَخْلُصَ إِلَى جِلْدِهِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَجْلِسَ عَلَى قَبْرٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێك لە ئێوە لەسەر پشکۆیەك لە ئاگر دابنیشێت، پۆشاکەکانی بسووتێنێت تا دەگات بە پێستەکەی

(و پێستەکەشی بسووتێنێت)، باشترە بۆی لەوەی لەسەر گۆڕێك دابنیشێت».

٥٤٤. عَنْ أَبِي مَرْثَدٍ الْغَنَوِيِّ ﵁ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَجْلِسُوا عَلَى الْقُبُورِ، وَلَا تُصَلُّوا إِلَيْهَا».

ئەبو مەڕسەدی غەنەوی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لەسەر گۆڕ دامەنیشن، ڕووەو گۆڕیش نوێژ مەکەن (چونکە بەگەورەزانینی گۆڕەکەی تێدایە)».

## بَابُ الْمَشْيِ فِي النَّعْلِ بَيْنَ الْقُبُورِ

## باسی ڕۆیشتن بە نەعلەوە بەنێو گۆڕەکاندا

٥٤٥. عَنْ أَنَسٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا وُضِعَ فِي قَبْرِهِ، وَتَوَلَّى عَنْهُ أَصْحَابُهُ إِنَّهُ لَيَسْمَعُ قَرْعَ نِعَالِهِمْ».

ئەنەس ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «کاتێك بەندە دەخرێتە نێو گۆڕەوە، هاوەڵەکانی پشتی لێ دەکەن و دەگەڕێنەوە، ئەو گوێی لە دەنگی نەعلەکانیان دەبێت کاتێك کە دەگەڕێنەوە».

## بَابٌ فِي تَحْوِيلِ الْمَيِّتِ مِنْ مَوْضِعِهِ لِلْأَمْرِ يَحْدُثُ

## باسێك دەربارەی گواستنەوەی گۆڕ لەبەر پێویستی و شتێك کە ڕوو بدات

٥٤٦. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: دُفِنَ مَعَ أَبِي رَجُلٌ، فَكَانَ فِي نَفْسِي مِنْ ذَلِكَ حَاجَةٌ، فَأَخْرَجْتُهُ بَعْدَ سِتَّةِ أَشْهُرٍ، فَمَا أَنْكَرْتُ مِنْهُ شَيْئًا، إِلَّا شُعَيْرَاتٍ كُنَّ فِي لِحْيَتِهِ مِمَّا يَلِي الْأَرْضَ.

جابير رضي الله عنه دەڵێت: باوکم لەگەڵ پیاوێکی دیکە نێژرابوو (لە ئوحود)، منیش لە دڵمدا شتێك دروست بووبوو (پێم خۆش بوو بیگوازمەوە)، بۆیە دوای شەش مانگ (لە گۆڕەکەی) دەرمهێنایەوە، هیچ شتێکی نامۆم نەبینی (کە بەسەر لاشەکەیدا هاتبێت)، تەنها چەند تاڵە موویەك نەبێت لە ڕیشی کە شۆڕ بووبوونەوە سەر زەوییەکە (ڕەنگیان گۆڕابوو).

## بَابٌ فِي الثَّنَاءِ عَلَى الْمَيِّتِ

### باسێك دەربارەی ستاییشکردنی مردوو

٥٤٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: مَرُّوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِجَنَازَةٍ فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ: «وَجَبَتْ»، ثُمَّ مَرُّوا بِأُخْرَى فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا شَرًّا، فَقَالَ: «وَجَبَتْ»، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ شُهَدَاءُ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: جەنازەیەکیان بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ تێپەڕاند، خەڵکی ستاییشی خێریان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «(ئەمە بەهەشتی) بۆ پێویست بوو»، پاشان جەنازەیەکی دیکەیان تێپەڕ کرد بە خراپە باسیان کرد، فەرمووی: «(ئەوە دۆزەخی) بۆ پێویست بوو»، پاشان فەرمووی: «ئێوە هەندێکتان شایەتن بەسەر هەندێکتانەوە (شایەتی ئێوە بۆ کەسێك کە دەمرێت حیسابی لەسەر دەکرێت)».

## بَابٌ فِي زِيَارَةِ الْقُبُورِ

### باسێك دەربارەی سەردانکردنی گۆڕستان

٥٤٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: أَتَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَبْرَ أُمِّهِ فَبَكَى، وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ،

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي تَعَالَى عَلَى أَنْ أَسْتَغْفِرَ لَهَا فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي، فَاسْتَأْذَنْتُ أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا فَأَذِنَ لِي، فَزُورُوا الْقُبُورَ فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ بِالْمَوْتِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانی گۆڕی دایکی کرد، خۆی گریا، ئەوانەی دەوروپشتی هەمووی هێنایە گریان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «داوای مۆڵەتم لە خوا کرد مۆڵەتم بدات داوای لێخۆشبوون بۆ دایکم بکەم، مۆڵەتی نەدام، داوای مۆڵەتم کرد کە ڕێگام بدات سەردانی گۆڕەکەی بکەم مۆڵەتی دام، بۆیە ئێوە سەردانی گۆڕستان بکەن لەبەر ئەوەی مردنتان بیر دەخاتەوە».

## بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا زَارَ الْقُبُورَ أَوْ مَرَّ بِهَا

### باسی ئەوەی دەگوترێت لە کاتی سەردانی گۆڕستان یان تێپەڕبوون پێیدا



٥٤٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ إِلَى الْمَقْبَرَةِ، فَقَالَ: «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ دَارَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَاحِقُونَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ گۆڕستان، فەرمووی: «سڵاوی خواتان لێ بێت ئەی کەسانی خەڵکی ئەم شوێنە لە بڕواداران، ئێمەش إن شاء الله بە ئێوە دەگەین».

# كِتَابُ الْأَيْمَانِ وَالنُّذُورِ

# پەرتووکی سوێندخواردن و نەزرکردن

## بَابُ التَّغْلِيظِ فِي الْأَيْمَانِ الْفَاجِرَةِ

### باسی هەڕەشەی توند لەسەر سوێندخواردنی بەدرۆ

٥٥٠. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ مَصْبُورَةٍ كَاذِبًا فَلْيَتَبَوَّأْ بِوَجْهِهِ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ».

عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك سوێندی مەحکەمە بەدرۆ بخوات، با شوێنی خۆی لەنێو ئاگردا دیاری بکات، کە لەسەر ڕوو دەخرێتە نێویەوە».

تێبینی:

(يَمِينٍ مَصْبُورَة): ئەو سوێندەی کە لەلای حاکم و دادوەر دەخورێت و بۆ پابەندکردنە.

## بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ الْحَلْفِ بِالْآبَاءِ

### باسێك دەربارەی ناپەسندیی سوێندخواردن بە باوك و باپیران

٥٥١. عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَدْرَكَهُ وَهُوَ فِي رَكْبٍ وَهُوَ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفًا فَلْيَحْلِفْ بِاللَّهِ، أَوْ لِيَسْكُتْ».

عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گەیشتوە ئەم لەنێو کاروانێکدا بوو (کۆمەڵێك وشتر بوو) سوێندی خوارد بە باوکی (سەرەتای ئیسلام بوو، نەیزانی)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «خوا قەدەغەی ئەوەتان لێ دەکات سوێند بە باوك و باپیرانتان بخۆن، ئەگەر کەسێك سوێندی خوارد یان با سوێند بە خوا بخوات، یان بێدەنگ بێت و سوێند نەخوات».

## بَابُ لَغْوِ الْيَمِينِ

### باسی سوێند بەدەمداهاتن

٥٥٢. قَالَتْ عَائِشَةُ ﵂: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «هُوَ كَلَامُ الرَّجُلِ فِي بَيْتِهِ، كَلَّا وَاللَّهِ، وَبَلَى وَاللَّهِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لەماڵەوە کەسێك دەڵێت نە والله، بەڵێ والله (مادام بەسەر زمانیدا دێت ئەمە لەغووی پێ دەگوترێت و کەفارەت ناکەوێتە سەری)».

## بَابُ الْمَعَارِيضِ فِي الْيَمِينِ

### باسی سوێندخواردن لەلارا (شاردنەوەی مەبەست)

٥٥٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَمِينُكَ عَلَى مَا يُصَدِّقُكَ عَلَيْهَا صَاحِبُكَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سوێندخواردنەکەت ئەوەیە کە هاوڕێکەت سوێندت دەدا لەسەری و بەڕاستت دەزانێت».

تێبینی:

لێرە نابێت تەورییە بەکار بهێنرێت، نابێت کەسێك لەسەر شتێك تۆ سوێند بدات، تۆ بە نیەتی خۆت سوێند لەسەر شتێکی دیکە بخۆیت، بەڵکوو ئەو لەسەر چی سوێندت دەدات بەگوێرەی نیەتی ئەوە نەك نیەتی تۆ، چونکە ئەمە بە درۆ دادەنرێت، مرۆڤ لەسەر چی سوێندیان دا، دەبێت لەسەر ئەوە سوێند بخوات، ئەگەرنا خۆی دەخەڵەتێنێت و گوناهبار و تاوانبار دەبێت.

## بَابُ الِاسْتِثْنَاءِ فِي الْيَمِينِ

### باسی هەڵاواردن لە سوێندخواردن

٥٥٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَلَفَ فَاسْتَثْنَى، فَإِنْ شَاءَ رَجَعَ وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ غَيْرَ حِنْثٍ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك سوێندی خوارد و لە سوێندەکەیدا هەڵاواردنی تێدا بوو (گوتی: إن شاء الله)، ئەوە ئەگەر

ویستی با کارەکە جێبەجێ بکات، ئەگەریش نەیویست با وازی لێ بێنێت و سوێندەکەش ناکەوێت».

## بَابُ الرَّجُلِ يُكَفِّرُ قَبْلَ أَنْ يَحْنَثَ

### باسی کەسێك کەفارەت بدات پێش ئەوەی سوێندەکەی بشکێنێت

٥٥٥. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ لِي النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم: «يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ سَمُرَةَ، إِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، فَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَكَفِّرْ يَمِينَكَ».

عەبدورڕەحمانی کوڕی سەمورە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم پێمی فەرموو: «ئەی عەبدورڕەحمانی کوڕی سەمورە، ئەگەر سوێندت خوارد لەسەر شتێك پاشان زانیت یان بۆت دەرکەوت کە ئەوەی دیکە بکەیت باشترە، ئەوە بڕۆ بیکە و کەفارەتی سوێندەکەت بدە».

## بَابٌ فِي الرَّقَبَةِ الْمُؤْمِنَةِ

### باسێك دەربارەی ئازادکردنی کۆیلەیەکی بڕوادار

٥٥٦. عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ الْحَكَمِ السُّلَمِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، جَارِيَةٌ لِي صَكَكْتُهَا صَكَّةً، فَعَظَّمَ ذَلِكَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم، فَقُلْتُ: أَفَلَا أُعْتِقُهَا؟ قَالَ: «ائْتِنِي بِهَا»، قَالَ: فَجِئْتُ بِهَا، قَالَ: «أَيْنَ اللَّهُ؟»، قَالَتْ: فِي السَّمَاءِ، قَالَ: «مَنْ أَنَا؟»، قَالَتْ: أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، قَالَ: «أَعْتِقْهَا فَإِنَّهَا مُؤْمِنَةٌ».

موعاویەی کوڕی حەکەمی سولەمی رضي الله عنه دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا

کەنیزەکێکم هەیە زللەیەکم لێ داوە، پێغەمبەریش ﷺ ئەو کارەی زۆر لەسەر گەورە کردم، بۆیە گوتم: ئەدی ئازادی نەکەم؟ فەرمووی: «بیهێنە بۆ لام»، گوتی: منیش هێنام بۆ خزمەتی، فەرمووی: «خوا لەکوێیە؟»، کەنیزەکەکەش گوتی: لە سەرەوەیە (لە ئاسمانە)، فەرمووی: «من کێم؟»، گوتی: تۆ پێغەمبەری خوای، فەرمووی: «ئازادی بکە، چونکە بەڕاستی بڕوادارە».

## بَابُ الِاسْتِثْنَاءِ فِي الْيَمِينِ بَعْدَ السُّكُوتِ

### باسی هەڵاواردن لە سوێنددا لەدوای بێدەنگبوون

٥٥٧. عَنْ عِكْرِمَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «وَاللَّهِ لَأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا، وَاللَّهِ لَأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا، وَاللَّهِ لَأَغْزُوَنَّ قُرَيْشًا»، ثُمَّ قَالَ: «إِنْ شَاءَ اللَّهُ».

عیکریمە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سوێند بە خوا دەبێت غەزای قوڕەیش بکەم، سوێند بە خوا دەبێت غەزای قوڕەیش بکەم، سوێند بە خوا دەبێ غەزای قوڕەیش بکەم»، پاشان فەرمووی: «إن شاء الله، واتە: ئەگەر خوا ویستی لەسەربوو (پاشان غەزای قوڕەیشی نەکرد، سوێندەکەشی شکاند و کەفارەتیشی نەدا، چونکە فەتحی مەککەی کرد بەبێ غەزا)».

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ النُّذُورِ

### باسی ڕێگریکردن لە نەزر

٥٥٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَأْتِي ابْنَ آدَمَ النَّذْرُ الْقَدَرَ بِشَيْءٍ لَمْ أَكُنْ قَدَّرْتُهُ لَهُ، وَلَكِنْ يُلْقِيهِ النَّذْرُ الْقَدَرَ قَدَّرْتُهُ، يُسْتَخْرَجُ مِنَ الْبَخِيلِ

يُؤْتِي عَلَيْهِ مَا لَمْ يَكُنْ يُؤْتِي مِنْ قَبْلُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ (لە فەرموودەیەكی قودسیدا) دەفەرموێت (خوا فەرموویەتی:) ئەو نەزرەی مرۆڤ دەیكات هیچ شتێك لەو قەدەرەی كە من بۆم دیاری كردووە ناگۆڕێت، بەڵام جار هەیە قەدەر لەگەڵ نەزرەكەی ئەو یەك دەگرنەوە، نەزر ئەو شتەیە (ئەو ماڵەیە) كە لە كەسی چرووك وەردەگیردرێت، ئەو ماڵەی لێ وەردەگیردرێت كە پێش نەزرەكە ئامادە نەبوو بیدات.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّذْرِ فِي الْمَعْصِيَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نەزری لە سەرپێچیی خوادا



٥٥٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللَّهَ فَلَا يَعْصِهِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر كەسێك نەزری كرد و نەزرەكەی گوێڕایەڵیی خوا بوو، با جێبەجێی بكات، هەر كەسێكیش نەزری كرد نەزرەكەی سەرپێچیی خوا بوو، با نەیكات».

## بَابُ مَنْ رَأَى عَلَيْهِ كَفَّارَةً إِذَا كَانَ فِي مَعْصِيَةٍ

### باسی ئەو كەسەی كە پێی وایە نەزری سەرپێچی كەفارەتی دەكەوێتە سەر

٥٦٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «نەزر لەسەرپێچیدا نییە (كەسێك

نەزری کرد نەزرەکەی سەرپێچی بوو پێویستە بیشکێنێت) و کەفارەتی سوێندەکەشی بدات».

٥٦١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ، اسْتَفْتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا نَذْرٌ لَمْ تَقْضِهِ؟ فَقَالَ: رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْضِهِ عَنْهَا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: سەعدی کوڕی عوبادە رضي الله عنه داوای فەتوای لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، وە پرسیاری لێ کرد و گوتی: دایکم وەفاتی کردووە و نەزرێکی لەسەر بووە جێبەجێی نەکردووە؟[1] پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «لەجیاتی دایکت نەزرەکەی بۆ جێبەجێ بکە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ

## باسی دەربارەی ئەوەی هاتووە کەسێك مردووە و ڕۆژوو قەرزدار بێت وماڵەوە بۆی بگرنەوە

٥٦٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ امْرَأَةً جَاءَتْ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّهُ كَانَ عَلَى أُمِّهَا صَوْمُ شَهْرٍ أَفَأَقْضِيهِ عَنْهَا، فَقَالَ: «لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ أَكُنْتِ قَاضِيَتَهُ؟»، قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: «فَدَيْنُ اللَّهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ پێی گوت: دایکم ڕۆژووی مانگێکی لەسەر بووە مردووە، ئایا لەجیاتی ئەو بۆی بگرمەوە؟ فەرمووی: «ئەگەر دایکت قەرزدار بوایە تۆ قەرزەکەت بۆی دەدایەوە؟»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «دەی قەرزی خوا لەپێشترە کە بدرێتەوە».

---

(١) دەگوترێت: ڕۆژووی نەزری لەسەر بووە، یان ئازادکردنی کۆیلە بووە، خێر بووە، یان نەزرێکی موتڵەق و ڕەها بووە، هەر شتێك بێت باس نەکراوە، بەڵام نەزری کردووە و جێبەجێی نەکردووە و وەفاتی کردووە.

## بَابُ فِيمَنْ نَذَرَ أَنْ يَتَصَدَّقَ بِمَالِهِ

### باسێك دەربارەی ئەو کەسەی نەزر دەکات هەموو ماڵەکەی ببەخشێت

٥٦٣. عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ مِنْ تَوْبَتِي أَنْ أَنْخَلِعَ مِنْ مَالِي صَدَقَةً إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَمْسِكْ عَلَيْكَ بَعْضَ مَالِكَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ»، قَالَ: فَقُلْتُ: إِنِّي أُمْسِكُ سَهْمِيَ الَّذِي بِخَيْبَرَ.

(کاتێك کەعبی کوڕی مالیك رضي الله عنه چاوی کوێر بوو، عەبدوڵلا دەستی باوکی دەگرت)، کەعبی کوڕی مالیك دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، من تەوبەم کردووە (لەو سێ کەسەی کە دوا کەوتن لە غەزای تەبوك، خوا تەوبەکەی قبووڵ کردن)، لە تەوبەکەم ئەوە بێت کە دەستبەرداری هەموو ماڵەکەم دەبم و هەمووی دەکەم بە خێر بۆ خوا و بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەندێك لە ماڵەکەت بهێڵەرەوە ئەمە باشترە بۆت»، دەڵێت: گوتم: من ئەم پشکەی لە خەیبەر هەمە ئەوە دەهێڵمەوە ئەوەی دیکە هەمووی دەکەم بە خێر.

## بَابُ مَنْ نَذَرَ نَذْرًا لَمْ يُسَمِّهِ

### باسی کەسێك نەزری کردوە و ناوی نەهێناوە (دیاری نەکردوە)

٥٦٤. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كَفَّارَةُ النَّذْرِ كَفَّارَةُ الْيَمِينِ».

عوقبەی کوڕی عامر رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کەفارەتی نەزرێك کە ناو نەهێنرابێت، کەفارەتی سوێند خواردنە».

## بَابُ مَنْ نَذَرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ ثُمَّ أَدْرَكَ الْإِسْلَامَ

### باسی کەسێك لە نەفامیدا نەزری کردووە دوایی موسوڵمان بووە

**٥٦٥.عَنْ عُمَرَ ﵁ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي نَذَرْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ لَيْلَةً، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «أَوْفِ بِنَذْرِكَ».**

**عومەر ﵁ دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا، من لە نەفامێتیدا نەزرم کردبوو کە شەوێك لە کەعبەی پیرۆزدا ئیعتیکاف بکەم، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «وەفادار بە بۆ نەزرەکەت (جێبەجێی بکە)».**

# كِتَابُ الْبُيُوعِ

# پەرتووکی مامەڵەکردن

## بَابٌ فِي التِّجَارَةِ يُخَالِطُهَا الْحَلْفُ وَاللَّغْوُ

## باسێك دەربارەی كڕین و فرۆشتن سوێندخواردن و قسەی بێمانا و ناشەرعی تێبكەوێت

٥٦٦. عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي غَرَزَةَ ﵁ قَالَ: كُنَّا فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نُسَمَّى السَّمَاسِرَةَ فَمَرَّ بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَسَمَّانَا بِاسْمٍ هُوَ أَحْسَنُ مِنْهُ، فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ التُّجَّارِ، إِنَّ الْبَيْعَ يَحْضُرُهُ اللَّغْوُ وَالْحَلْفُ، فَشُوبُوهُ بِالصَّدَقَةِ».

قەیسی كوڕی ئەبو غەرزە ﵁ دەڵێت: ئێمە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان دەگوترا: سەماسیرە (واتە: دەلاڵ)، پێغەمبەری خوا ﷺ بەلاماندا تێپەڕی ناوێكی لەوە باشتری لێ ناین، فەرمووی: «ئەی گرۆی بازرگانان (ناومانی گۆڕی بۆ بازرگان)، ئەم كڕین و فرۆشتنانە قسەی بێمانا و بێسوود و سوێندخواردنی تێدەكەوێت، بۆیە كڕین و فرۆشتنەكەتان تێكەڵ بكەن بە خێر».

## بَابُ فِي اجْتِنَابِ الشُّبُهَاتِ

### باسێك دەربارەی خۆدوورخستنەوە لەهەر شتێك کە گومانی تێدا بێت

٥٦٧. عن النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنه يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ الْحَلَالَ بَيِّنٌ، وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا أُمُورٌ مُشْتَبِهَاتٌ، وَسَأَضْرِبُ لَكُمْ فِي ذَلِكَ مَثَلًا، إِنَّ اللَّهَ حَمَى حِمًى، وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَا حَرَّمَ، وَإِنَّهُ مَنْ يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُخَالِطَهُ، وَإِنَّهُ مَنْ يُخَالِطُ الرِّيبَةَ يُوشِكُ أَنْ يَجْسُرَ».

نوعمانی کوڕی بەشیر رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «حەڵاڵ ئاشکرا و ڕوونە، حەرامیش ئاشکرا و ڕوونە، هەندێك شتیش هەیە لەو نێوانەدایە، لەم بابەتە نموونەیەکتان بۆ دەهێنمەوە: خوا سنووری هەیە، سنوورەکانی خوا ئەو شتانەیە کە حەرامی کردووە، (نموونەکە ئەوەیە) ئەگەر شوانێك ڕانەمەڕێکی هەبێت لە نزیك پاوانێك ڕانەمەڕەکەی بلەوەڕێنێت، نزیکە بچنە نێو ئەو پاوانە، بەڵام خۆتی لێ بپارێزیت ئەوە پارێزراو دەبیت، هەر کەسێك تێکەڵی ئەو گومانانە ببێت نزیکە بکەوێتە نێو حەرامەوە».

## بَابُ فِي آكِلِ الرِّبَا وَمُوكِلِهِ

### باسێك دەربارەی سووخۆر سووەرگر

٥٦٨. عن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ آكِلَ الرِّبَا، وَمُؤْكِلَهُ وَشَاهِدَهُ وَكَاتِبَهُ.

عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لەو کەسەی سوو دەخوات، لەو کەسەی سووی پێ دەدات، لەو کەسەی کە شایەتە

و لەو کەسەی کە نووسەری بەڵێننامەی مامەڵەی سوویە (نەفرەت لە هەموویان کراوە).

## بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ الْيَمِينِ فِي الْبَيْعِ

### باسێك دەربارەی ناپەسندیی سوێندخواردن لە کاتی کڕین و فرۆشتندا

٥٦٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْحَلِفُ مَنْفَقَةٌ لِلسِّلْعَةِ مَمْحَقَةٌ لِلْبَرَكَةِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «سوێندخواردنی درۆ دەبێتە هۆی ڕەواجدان بە شتومەکەکە و خێرا فرۆشتنی، بەڵام بەرەکەت ناهێڵێت و لەناوی دەبات».

## بَابٌ فِي التَّشْدِيدِ فِي الدَّيْنِ

### باسێك دەربارەی هەڕەشە لە قەرزداریدا

٥٧٠. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَا يُصَلِّي عَلَى رَجُلٍ مَاتَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، فَأُتِيَ بِمَيِّتٍ، فَقَالَ: «أَعَلَيْهِ دَيْنٌ؟»، قَالُوا: نَعَمْ، دِينَارَانِ، قَالَ: «صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ»، فَقَالَ أَبُو قَتَادَةَ الْأَنْصَارِيُّ: هُمَا عَلَيَّ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَصَلَّى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، قَالَ: «أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ، فَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ».

جابیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کەسێك نەدەکرد مردبێت و قەرزدار بێت، مردوویەکیان هێنا، فەرمووی: «ئایا قەرزی لەسەرە؟»، گوتیان:

بەڵێ، دوو دینار قەرزدارە، فەرمووی: «خۆتان نوێژ لەسەر هاوڕێکەتان بکەن»، ئەبو قەتادەی ئەنصاڕی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، نوێژی لەسەر بکە ئەو دوو دینارە من بۆی دەدەمەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی لەسەر کرد، دوای ئەوەی کە خوا فەتحی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و غەنیمەی دەست کەوت، فەرمووی: «من لە هەموو بڕواداریێك لەپێشترم لە خودی خۆشیان، هەر کەسێك قەرزی بەجێ هێشت لەسەر منە من بۆی دەدەمەوە (قەرزی قەرزداری داوەتەوە)، ئەوەی ماڵی بەجێ هێشت بۆ من نییە بۆ میراتگرانیەتی».

## بَابٌ فِي الْمَطْلِ

### باسێك دەربارەی دواخستنی قەرز (بەئەنقەست)

٥٧١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ فَلْيَتْبَعْ».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دواخستنی قەرز لەلایەن قەرزدارەوە کە دەوڵەمەند بێت، ئەوە ستەمە، ئەگەر یەکێك لە ئێوە ڕەوانە کرا بۆلای کەسێکی دەوڵەمەند (واتە: قەرزت لای کەسێکە پێت دەڵێت: بڕۆ لە فڵانە کەسی دەوڵەمەند کە قەرزم لایەتی لەجیاتی من لێی وەربگرەوە)، با بچێت وەریبگرێتەوە».

## بَابٌ فِي حُسْنِ الْقَضَاءِ

### باسێك دەربارەی دانەوەی قەرز بەجوانی

٥٧٢. عَنْ أَبِي رَافِعٍ رضي الله عنه قَالَ: اسْتَسْلَفَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَكْرًا، فَجَاءَتْهُ إِبِلٌ مِنَ

الصَّدَقَةِ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَقْضِيَ الرَّجُلَ بَكْرَهُ، فَقُلْتُ: لَمْ أَجِدْ فِي الْإِبِلِ إِلَّا جَمَلًا خِيَارًا رَبَاعِيًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَعْطِهِ إِيَّاهُ، فَإِنَّ خِيَارَ النَّاسِ أَحْسَنُهُمْ قَضَاءً».

ئەبو ڕافیع ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەچکە وشترێکی بەقەرز لێ وەرگرتبوو (قەرزی کردبوو)، پاشان وشتری صەدەقەی بۆ هات، فەرمانی پێ کردم وشترێك بدەمەوە بەو پیاوەی قەرزی لێی کردبوو، گوتم: لەنێو وشترەکاندا تەنها وشتری گەورەی هەڵبژاردەی تێدایە کە شەش ساڵی تەواو کردووە چۆتە نێو حەوت ساڵەوە، دانە چوارینەکانی دەرچووە زۆر چاکە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «بڕۆ ئەو چاکەی بدەرێ، لەبەر ئەوەی باشترین کەس ئەو کەسەیە کە قەرز بەباشەوە دەداتەوە».

٥٧٣. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ لِي عَلَى النَّبِيِّ ﷺ دَيْنٌ فَقَضَانِي وَزَادَنِي.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: قەرزم لەسەر پێغەمبەر ﷺ بوو، بە زیادەوە پێی دامەوە. (ئەو زیادەیە وەکوو هەدیە وایە، لە کاتی قەرزکردندا نابێت مەرجی زیادە وەرگرتنی تێدا بێت، دەنا دەبێتە سوو).

## بَابُ فِي الصَّرْفِ

### باسێك دەربارەی ئاڵوگۆڕکردنی پارە

٥٧٤. عَنْ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الذَّهَبُ بِالْوَرِقِ رِبًا، إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا، إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِبًا إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا إِلَّا هَاءَ وَهَاءَ».

عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئاڵتوون بە زیو بگۆڕیتەوە ڕیبایە، مەگەر تۆ بڵێیت: ها، ئەویش بڵێت: ها، گەنم بە گەنم بگۆڕیتەوە دەبێت بە

ڕیبا، مەگەر دەست بە دەست بێت، خورما بە خورما بگۆڕیتەوە ڕیبایە مەگەر دەست بە دەست بێت، تۆ بڵێیت: ها، ئەویش بڵێت: ها (ئەو بڵێت: وەریبگرە، ئەویش بڵێت: وەریبگرە، وە دەبێت وەكوو یەكیش بێت)، وە جۆ بە جۆ بگۆڕیتەوە ڕیبایە مەگەر تۆ بڵێیت: ها، ئەویش بڵێت: ها».

## بَابٌ فِي بَيْعِ الثِّمَارِ قَبْلَ أَنْ يَبْدُوَ صَلَاحُهَا

### باسێك دەربارەی فرۆشتنی بەروبووم پێش ئەوەی كە پێبگات

٥٧٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الثِّمَارِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلَاحُهَا، نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ.

عەبدوڵڵای كوڕی عومەر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردووە بەرهەمی دار بفرۆشرێت هەتا چاكێتییەكەی دەرنەكەوێت، قەدەغەی لە كڕیار و فرۆشیاریش كردووە.

## بَابٌ فِي زَرْعِ الْأَرْضِ بِغَيْرِ إِذْنِ صَاحِبِهَا

### باسێك دەربارەی كشتوكاڵكردن بەبێ مۆڵەتی خاوەن زەوی

٥٧٦. عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ زَرَعَ فِي أَرْضِ قَوْمٍ بِغَيْرِ إِذْنِهِمْ، فَلَيْسَ لَهُ مِنَ الزَّرْعِ شَيْءٌ وَلَهُ نَفَقَتُهُ».

ڕافیعی كوڕی خەدیج ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر كەسێك كشتوكاڵی كرد لە زەوی كەسێكدا بەبێ مۆڵەتیان، ئەوە هیچ شتێك لەو كشتوكاڵەی بۆ نییە، ئەمیش چەندێك خەرجیی كردووە پێی دەدرێتەوە».

خاوەن كەڵبەیەك لە دڕندەكاندا (ئەوەی دڕندە بێت و كەڵبەی هەبێت خواردنی حەرامە، تەنها كەمتیار جیا كراوەتەوە و حەڵاڵە)، وە هەر شتێك كە چڕنووكی هەبێت لە باڵندەدا (وەكوو: هەڵۆ، باز، نەسر).

## بَابُ فِي الْجَمْعِ بَيْنَ لَوْنَيْنِ فِي الْأَكْلِ

### باسێك دەربارەی دوو جۆر خواردن كۆبكەیتەوە لە كاتی خواردندا

٦٥٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ: كَانَ يَأْكُلُ الْقِثَّاءَ بِالرُّطَبِ.

عەبدوڵڵای كوڕی جەعفەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ خەیار یان ترۆزی بە خورماوە دەخوارد (بەیەكەوە خواردوویەتی).

## بَابُ مَا يَقُولُ الرَّجُلُ إِذَا طَعِمَ

### باسی ئەو (زیكر)ەی كە موسوڵمان دوای نان خواردن دەیڵێت

٦٥٣. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا رُفِعَتِ الْمَائِدَةُ قَالَ: «الْحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ غَيْرَ مَكْفِيٍّ، وَلَا مُوَدَّعٍ، وَلَا مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبُّنَا».

واتە: ئەبو ئومامە ﵁ دەڵێت: كاتێك سفرە و خوان هەڵدەگیرایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «سوپاس و ستاییش تەنها شایەنی خوایە، سوپاس و ستاییشێكی زۆری پاكی بێگەردی بەرەكەتدار، خوای گەورەمان بەسە و وەلا نەنراوین، پەروەردگارمان زاتێكە كە هیچ شتێك لێی بێنیاز نییە».

## بَابٌ فِي غَسْلِ الْيَدِ مِنَ الطَّعَامِ

### باسێك دەربارەی دەستشوشتن لەدوای نانخواردن

٦٥٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَامَ وَفِي يَدِهِ غَمَرٌ، وَلَمْ يَغْسِلْهُ فَأَصَابَهُ شَيْءٌ، فَلَا يَلُومَنَّ إِلَّا نَفْسَهُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك شەوان بخەوێت و دەستی چەوری خواردنەکەی پێوە بێت، نەیشوات و دواتر تووشی شتێك بوو، ئەوە با لۆمەی کەس نەکات جگە لە خۆی».

# كِتَابُ الطِّبِّ

## پەرتووكی پزیشكی

### بَابٌ فِي النُّشْرَةِ

باسێك دەربارەی نوشرە (كە جۆرە نوشتەیەكە)



٦٥٥. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ النُّشْرَةِ فَقَالَ: «هُوَ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ».

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێت: دەربارەی نوشرە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرا، ئەویش فەرمووی: «ئەوە (كردەوەیەكە) لە كردەوەی شەیتانە».

✍ تێبینی:

(النُّشْرَة): جۆرە نوشتەیەك بووە كە بە حیساب چارەسەری شێت و نەخۆش و ئەو كەسانەیان پێ كردووە كە پێیان وا بووە جن دەستی لێ وەشاندووە، گوتراویشە: بەشێكە لە جادوو (سیحر).

## بَابٌ فِي الْأَدْوِيَةِ الْمَكْرُوهَةِ

### باسێك دەربارەی (بەکارهێنانی) دەرمانی ناپەسند و خراپ

٦٥٦. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عُثْمَانَ ﵁: أَنَّ طَبِيبًا سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ ضِفْدَعٍ يَجْعَلُهَا فِي دَوَاءٍ، فَنَهَاهُ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ قَتْلِهَا.

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عوسمان ﵁ دەگێڕێتەوە: پزیشکێك دەربارەی بۆق کە بکرێتە نێو دەرمانەوە پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ ڕێگریی لێ کرد کە بۆق بکوژێت.

٦٥٧. عَنْ سُوَيْدِ بْنِ طَارِقٍ ﵁: سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الْخَمْرِ، فَنَهَاهُ، ثُمَّ سَأَلَهُ فَنَهَاهُ، فَقَالَ لَهُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، إِنَّهَا دَوَاءٌ، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا، وَلَكِنَّهَا دَاءٌ».

سوەیدی کوڕی تاریق ﵁ دەگێڕێتەوە: پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی مەی، ئەویش قەدەغەی کرد، پاشان پرسیاری لێی کرد، ئەوجاریش قەدەغەی کرد، پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە چارەسەرە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «نەخێر هەرگیز چارەسەر نییە، بەڵکوو نەخۆشییە».

## بَابٌ فِي تَمْرَةِ الْعَجْوَةِ

### باسێك دەربارەی خورمای عەجوە

٦٥٨. عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَصَبَّحَ سَبْعَ تَمَرَاتٍ عَجْوَةٍ لَمْ يَضُرَّهُ ذَلِكَ الْيَوْمَ سَمٌّ وَلَا سِحْرٌ».

عامیری کوڕی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص، لە باوکییەوە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ

دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێك بەیانی بکاتەوە بە حەوت دەنك خورمای عەجوە (واتە: بەیانییان حەوت دەنك خورمای عەجوە بخوات)، ئەوە ئەو ڕۆژە نە ژەهر نە جادوو زەرەر و زیانی پێ ناگەیەنێت».

## بَابٌ فِي الْأَمْرِ بِالْكَحْلِ

### باسێك دەربارەی فەرمانکردن بە چاوڕشتن

٦٥٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ، وَإِنَّ خَيْرَ أَكْحَالِكُمُ الْإِثْمِدُ: يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە بەرگ و پۆشاکدا پۆشاکی سپی لەبەر بکەن، لەبەر ئەوەی باشترین پۆشاکتان سپییە، مردووەکانیشتان هەر بە خامی سپی کفن بکەن، باشترین ئەو شتەشی کە چاوی پێ دەڕێژن کلە، کە چاو ڕووناك و بەهێز دەکات، هەروەها برژانگی چاویش دەڕوێنێتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْعَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چاوپیسی

٦٦٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْعَيْنُ حَقٌّ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «چاو هەقە (کاریگەری چاو شتێکی ڕاستییە و نکووڵی لێ ناکرێت)».

٦٦١. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ يُؤْمَرُ الْعَائِنُ فَيَتَوَضَّأُ ثُمَّ يَغْتَسِلُ مِنْهُ الْمَعِينُ.

عائیشه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەکرد ئەگەر گومانت لە کەسێکە زەرەری لێ داویت بە چاوی، پێی دەڵێیت: دەستنوێژ بشوات لە قاپێکدا، پاشان (ئاوی دەستنوێژەکە دێنێت)، ئەو کەسەی کە تووش بووە ئاوەکە بە خۆیدا دەکات.

## بَابٌ فِي تَعْلِيقِ التَّمَائِمِ

## باسێك دەربارەی هەڵواسینی نوشتە

٦٦٢. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا رُقْيَةَ إِلَّا مِنْ عَيْنٍ، أَوْ حُمَةٍ».

عیمرانی کوڕی حوصەین رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «نوشتەکردن ڕێگەپێدراو نییە، تەنها بۆ چاوەزار و چارەسەری ژەهری جڕوجانەوەری ژەهردار نەبێت».

## بَابُ كَيْفَ الرُّقَى

## باسی چۆنیەتی نوشتە

٦٦٣. عَنْ عَبْدِ الْعَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ قَالَ: قَالَ أَنَسٌ يَعْنِي لِثَابِتٍ: أَلَا أَرْقِيكَ بِرُقْيَةِ رَسُولِ اللَّهِ؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: فَقَالَ: «اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ مُذْهِبَ الْبَأْسِ، اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لَا شَافِيَ إِلَّا أَنْتَ، اشْفِهِ شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا».

عەبدولعەزیزی کوڕی صوهەیب دەڵێت: ئەنەس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بە سابیت دەڵێت: ئایا ڕوقیەت بۆ نەکەم بەو ڕوقیەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردی؟ گوتی: بەڵێ، بۆم بکە، دەڵێت:

فەرمووی: «ئەی پەروەردگاری هەموو خەڵکی، ئەی ئەو خوایەی کە نەخۆشی لادەبەیت، شیفای ئەم نەخۆشە بدە، هەر تۆ شیفادەری، هیچ شیفادەرێك نییە جگە لە تۆ، شیفایەکی تەواوی بدە کە هیچ نەخۆشییەك نەهێڵێت».

٦٦٤. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقُولُ لِلْإِنْسَانِ إِذَا اشْتَكَى يَقُولُ: بِرِيقِهِ ثُمَّ قَالَ بِهِ فِي التُّرَابِ: «تُرْبَةُ أَرْضِنَا، بِرِيقَةِ بَعْضِنَا، يُشْفَى سَقِيمُنَا، بِإِذْنِ رَبِّنَا».

عائیشە ﵂ دەڵێت: کەسێك نەخۆش بووایە پێغەمبەر ﷺ بە تفەکەی ئاوای دەکرد و دەیکردە نێو خۆڵەوە (واتە: هەندێك تفی دەکردە سەر پەنجەی دەیکردە نێو خۆڵەکەوە)، چەندێك خۆڵی هەڵگرتایە پاشان دەیخستە سەر شوێنی ئەو برینە، دەیفەرموو: «خۆڵی زەوییەکەمان، بە تفی هەندێکمان، شیفای نەخۆشەکەمان بدە، بە مۆڵەتی پەروەردگارمان».

٦٦٥. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا اشْتَكَى يَقْرَأُ فِي نَفْسِهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ وَيَنْفُثُ، فَلَمَّا اشْتَدَّ وَجَعُهُ كُنْتُ أَقْرَأُ عَلَيْهِ وَأَمْسَحُ عَلَيْهِ بِيَدِهِ رَجَاءَ بَرَكَتِهَا.

عائیشەی ﵂ خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ نەخۆش بووایە و ئێش و ئازاری هەبووایە سوورەتی (ناس و فەلەق) ی دەخوێند بەسەر خۆیدا و فووی پێدا دەکرد، بەڵام لە سەرەمەرگدا ئازارەکەی زۆر زۆر بوو (نەیدەتوانی بەسەر خۆیدا بیخوێنێت)، من سوورەتی (ناس و فەلەق)م بەسەردا دەخوێند، بەڵام دەستی خۆیم بەسەر خۆیدا دەهێنا بە ئومێدی بەرەکەت (لەبەر ئەوەی دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ موبارەکە).

# بَابٌ فِي الطِّيَرَةِ

## باسێك دەربارەی شوومی (ڕەشبینی)

٦٦٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الطِّيَرَةُ شِرْكٌ، الطِّيَرَةُ شِرْكٌ» ثَلَاثًا، وَمَا مِنَّا إِلَّا وَلَكِنَّ اللَّهَ يُذْهِبُهُ بِالتَّوَكُّلِ.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە سێ جار فەرموویەتی: «تیەڕە شیرکە، تیەڕە شیرکە»، (ئیبن مەسعوود خۆی دەڵێت:) هەموو کەسێك لە ئێمە شتی ئاوا لە دڵیدایە، بەڵام چەندێك پشتت بە خوای گەورە بەستبێت، خوا ئەم شتە ناهێڵێت.


تێبینی:

(الطِّيَرَة): ئەو شتەیە کە مرۆڤ بەهۆیەوە خۆی تووشی ڕەشبینی یان گەشبینی دەکات، ئەوەی بێزراوە لە شەرعدا ئەوەیە کە تووشی ڕەشبینیت بکات.

# كِتَابُ الْحُرُوفِ وَالْقِرَاءَاتِ

## پەرتووکی پیتەکانی قورئان و شێوازی خوێندنەوەکانی



٦٦٧. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْبَخَلِ وَالْهَرَمِ».

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «خوایە پەنا بە تۆ دەگرم لە ڕەزیلی و پیری و پەککەوتەیی».

٦٦٨. عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ ﵂: أَنَّهَا سَمِعَتِ النَّبِيَّ ﷺ يَقْرَأُ: «(إِنَّهُ عَمِلَ غَيْرَ صَالِحٍ)».

ئەسمائی کچی یەزید ﵂ دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو بەم شێوازە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە «(إِنَّهُ عَمِلَ غَيْرَ صَالِحٍ)». (واتە: -عمِل- بە فیعلێك کە عەین فیعلەکەی مەکسورە، چونکە لە موصحەفدا ئاوا هاتووە (عَمَلٌ) بە ئیسم).

٦٦٩. عَنْ شَهْرِ بْنِ حَوْشَبٍ قَالَ: سَأَلْتُ أُمَّ سَلَمَةَ ﵂: كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ هَذِهِ الْآيَةَ: {إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ} هود: ٤٦؟ فَقَالَتْ: قَرَأَهَا: «(إِنَّهُ عَمِلَ غَيْرَ صَالِحٍ)».

شەهری کوڕی حەوشەب دەڵێت: پرسیارم لە ئوم سەلەمە ﵂ کرد ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی چۆن دەخوێندەوە: {إِنَّهُ عَمَلٌ غَيْرُ صَالِحٍ}؟ گوتی: ئاوای دەخوێندەوە: «(إِنَّهُ عَمِلَ غَيْرَ صَالِحٍ)».

٦٧٠. عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا دَعَا بَدَأَ بِنَفْسِهِ وَقَالَ: «رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْنَا وَعَلَى مُوسَى لَوْ صَبَرَ لَرَأَى مِنْ صَاحِبِهِ الْعَجَبَ».

ئوبەی کوڕی کەعب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نزای خێری بکردایە لە خۆیەوە دەستی پێ دەکرد (یەکەمجار دوعا و نزای بۆ خۆی دەکرد، ئینجا بۆ جگە لە خۆی)، دەیفەرموو: «ڕەحمەتی خوا لە ئێمە و لە مووسا بێت، ئەگەر ئارامی بگرتایە ئەوە لە (خدری) هاوڕێیەوە شتی زۆر سەیر و سەرسوڕهێنەری دەبینی (سێ شتی لێ بینی زۆر سەیر بوو، بەڵام ئارامی نەگرت و لێی جیا بۆوە)».



٦٧١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْرَؤُهَا: {فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ} القمر: ١٥، يَعْنِي مُثَقَّلاً، قَالَ أَبُو دَاوُدَ: مَضْمُومَةُ الْمِيمِ مَفْتُوحَةُ الدَّالِ مَكْسُورَةُ الْكَافِ.

عەبدوڵڵا ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی ئاوا دەخوێندەوە: {فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ}، واتە: دالەکە شەددەی لەسەر بێت، ئەبو داود دەڵێت: بە زەممەی میمەکە و دالەکەش فەتحەی لەسەر بێت و کافەکەش کەسرەی لەژێر بێت (وە موصحەفەکەش هەر بەو شێوازەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوازە خوێندوویەتەوە، مانای ئایەتەکەش: ئایا کەس هەیە پەند و ئامۆژگاری لەم ئایەتانە وەربگرێت؟).

٦٧٢. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ ذَكَرَتْ أَوْ كَلِمَةً غَيْرَهَا قِرَاءَةَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: {بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ. الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ. مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ}، يُقَطِّعُ قِرَاءَتَهُ آيَةً آيَةً. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: سَمِعْتُ أَحْمَدَ يَقُولُ الْقِرَاءَةُ الْقَدِيمَةُ: (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ).

ئوم سەلەمە ﵂ گێڕاویەتەوە خوێندنەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بووە: {بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ}، کەمێك ڕاوەستاوە، {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ}، کەمێك وەستاوە، {الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ}، وەستاوە، {مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ}، بە فەتحەی میمەکە، (پێغەمبەر ﷺ) ئایەت ئایەت قوڕئانی خوێندووە و لەسەریان دەوەستا. ئەبو داود دەڵێت: گوێم لە ئەحمەد بوو دەیگوت: خوێندنەوەی کۆنی بەم شێوەیە بوو: (مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ)، (واتە: میمەکە مەددێکی دوو حەڕەکەیی هەبووە و بە ئەلیف نووسراوە، نەك فەتحە).

٦٧٣. عَنْ ابْنِ الْأَسْقَعِ ﵁ يَقُولُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ جَاءَهُمْ فِي صُفَّةِ الْمُهَاجِرِينَ فَسَأَلَهُ إِنْسَانٌ: أَيُّ آيَةٍ فِي الْقُرْآنِ أَعْظَمُ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «{اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ} البقرة: ٢٥٥».

ئیبن ئەسقەع ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لای ئەهلی صوففە (موهاجیرە هەژارەکان لە مزگەوتدا)، کەسێك پرسیاری لێ کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، گەورەترین ئایەت لە قوڕئاندا کامەیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «{اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ}».

٦٧٤. عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﵁: أَنَّهُ قَرَأَ: {هَيْتَ لَكَ} يوسف: ٢٣، فَقَالَ: شَقِيقٌ: إِنَّا نَقْرَؤُهَا (هِئْتُ لَكَ) يَعْنِي فَقَالَ: ابْنُ مَسْعُودٍ: أَقْرَؤُهَا كَمَا عُلِّمْتُ أَحَبُّ إِلَيَّ.

ئیبن مەسعود ﵁ ئەم ئایەتەی بە: {هَيْتَ لَكَ}، خوێندۆتەوە، شەقیق گوتی: ئێمە بە (هِئْتُ لَكَ)، دەیخوێنینەوە، ئیبن مەسعود گوتی: بەم شێوازەی پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردووم ئاوا پێمخۆشترە بیخوێنمەوە.

٦٧٥. عَنْ شَقِيقٍ قَالَ: قِيلَ لِعَبْدِ اللَّهِ ﵁: إِنَّ أُنَاسًا يَقْرَءُونَ هَذِهِ الْآيَةَ: {وَقَالَتْ هِيتَ لَكَ} يوسف: ٢٣، فَقَالَ: إِنِّي أَقْرَأُ كَمَا عُلِّمْتُ أَحَبُّ إِلَيَّ: {وَقَالَتْ هَيْتَ

لَكَ} یوسف: ٢٣.

شەقیق دەڵێت: بە عەبدوڵڵا (ی کوڕی مەسعوود) ﵁ گوترا: کەسانێك ئەم ئایەتە: {وَقَالَتْ هِيْتَ لَكَ}، ئاوا دەیخوێننەوە، گوتی: من وا پێمخۆشە چۆن فێر کراوم لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ ئاوا بیخوێنمەوە، من دەڵێم: {وَقَالَتْ هَيْتَ لَكَ}، (لە موصحەفەکەش ئاوایە).

# كِتَابُ الْحَمَّامِ

## پەرتووكی باسی گەرماو

٦٧٦. عَنْ أَبِي الْمَلِيحِ قَالَ: دَخَلَ نِسْوَةٌ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ عَلَى عَائِشَةَ ﵂، فَقَالَتْ: مِمَّنْ أَنْتُنَّ؟ قُلْنَ: مِنْ أَهْلِ الشَّامِ، قَالَتْ: لَعَلَّكُنَّ مِنَ الْكُورَةِ الَّتِي تَدْخُلُ نِسَاؤُهَا الْحَمَّامَاتِ، قُلْنَ: نَعَمْ، قَالَتْ: أَمَا إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنَ امْرَأَةٍ تَخْلَعُ ثِيَابَهَا فِي غَيْرِ بَيْتِهَا، إِلَّا هَتَكَتْ مَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ تَعَالَى».

ئەبو مەلیح دەڵێت: کۆمەڵە ژنێكی خەڵكی شام چوونە لای عائیشە ﵂، ئەویش گوتی: ئێوە لەكوێوە هاتوون؟ گوتیان: خەڵكی شامین (لەوێوە هاتووین)، عائیشە گوتی: لەوانەیە ئێوە خەڵكی ئەو ناوچەیە بن كە ژنەكانیان دەچنە گەرماوەكان (گەرماوە گشتییەكان)، گوتیان: بەڵێ، گوتی: بەڵام من خۆم گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هیچ ئافرەتێك نییە كە جلەكانی لە خۆی دانێت و لە ماڵی خۆی نەبێت، ئەوا بێگومان ئەو سنوورەی نێوان خۆی و خوای شكاندووە».

## بَابُ النَّهْيِ عَنِ التَّعَرِّي

### باسی ڕێگریکردن لە خۆڕووتکردنەوە

٦٧٧. عَنْ يَعْلَى ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَأَى رَجُلاً يَغْتَسِلُ بِالْبَرَازِ بِلَا إِزَارٍ، فَصَعَدَ الْمِنْبَرَ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ ﷻ حَيِيٌّ سِتِّيرٌ، يُحِبُّ الْحَيَاءَ وَالسَّتْرَ، فَإِذَا اغْتَسَلَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَتِرْ».

یەعلا ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی بینی لە دەشتێکی فراواندا خۆی دەشوشت بەبێ ئەوەی کە شتێکی لەپێدا بێت (شەروال)، دواتر پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر مینبەر حەمد و سەنا و ستاییشی خوای کرد، پاشان فەرمووی: «خوا ﷻ زۆر بەشەرمە، وە زۆر داپۆشەری کەموکوڕی خەڵکییە (ئابڕووی خەڵك نابات)، شەرمی خۆش دەوێت و داپۆشینیشی خۆش دەوێت، ئەگەر یەکێك لە ئێوە خۆی شوشت، با پەردەیەك هەبێت و لەبەر چاوی خەڵك خۆی نەشوات».

٦٧٨. عَنْ زُرْعَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ جَرْهَدٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: كَانَ جَرْهَدٌ هَذَا مِنْ أَصْحَابِ الصُّفَّةِ قَالَ: جَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَنَا وَفَخِذِي مُنْكَشِفَةٌ فَقَالَ: «أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الْفَخِذَ عَوْرَةٌ».

زورعەی کوڕی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی جەرهەد، لە باوکییەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: جەرهەد (کە باوکی عەبدوڕڕەحمانە، وە باپیری زورعەیە) یەکێك بووە لەوانەی کە ئەهلی صوففە بوونە و لە موهاجیرە هەژارەکان بوونە، لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ ماونەتەوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەلامان دانیشت، ڕانم دەرکەوتبوو، فەرمووی: «ئایا نازانی ڕان عەورەتە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّعَرِّي

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆڕووتکردنەوە

٦٧٩. عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ قَالَ: حَمَلْتُ حَجَرًا ثَقِيلًا، فَبَيْنَا أَمْشِي فَسَقَطَ عَنِّي ثَوْبِي، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خُذْ عَلَيْكَ ثَوْبَكَ وَلَا تَمْشُوا عُرَاةً».

میسوەری کوڕی مەخرەمە دەڵێت: بەردێکی قورسم هەڵگرت، کاتێك کە دەڕۆیشتم پۆشاکەکەم بەربووەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: «پۆشاکەکەت هەڵبگرە و لەبەری بکەوە، بەڕووتی مەڕۆن بە ڕێگادا».

٦٨٠. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَنْظُرُ الرَّجُلُ إِلَى عُرْيَةِ الرَّجُلِ، وَلَا الْمَرْأَةُ إِلَى عُرْيَةِ الْمَرْأَةِ، وَلَا يُفْضِي الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ فِي ثَوْبٍ وَاحِدٍ، وَلَا تُفْضِي الْمَرْأَةُ إِلَى الْمَرْأَةِ فِي ثَوْبٍ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «با پیاو تەماشای عەوڕەتی پیاو نەکات، وە با ئافرەتیش تەماشای عەوڕەتی ئافرەت نەکات، با پیاو لەگەڵ پیاودا بەڕووتی لەژێر یەك پۆشاکدا نەبن، با ئافرەتیش لەگەڵ ئافرەتدا بەڕووتی لەژێر یەك پۆشاکدا نەبن».

# كِتَابُ اللِّبَاسِ

## پەرتووکی بەرگ و پۆشاك

### بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا لَبِسَ ثَوْبًا جَدِيدًا

### باسی ئەوەی دەگوترێت لە کاتی پۆشینی پۆشاکی نوێ

٦٨١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا اسْتَجَدَّ ثَوْبًا سَمَّاهُ بِاسْمِهِ إِمَّا قَمِيصًا، أَوْ عِمَامَةً ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ أَسْأَلُكَ مِنْ خَيْرِهِ وَخَيْرِ مَا صُنِعَ لَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ، وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ».

ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکێکی تازەی لەبەر بکردایە بەناوی خۆیەوە ناوی دەهێنا، جا کراس بووایە یان مێزەر بووایە ناوی دەهێنا، پاشان دەیفەرموو: «سوپاس و ستاییش بۆ تۆ خوایە ئەم پۆشاکە تۆ پێت بەخشیم و تۆ پۆشتەت کردم، خوایە داوای خێر و چاکەی ئەم پۆشاکەت لێ دەکەم (ناوی دەهێنا)، ئەو خێر و چاکەیەش کە بۆی دروست کراوە، پەناشت پێ دەگرم لە شەڕ و خراپەی ئەو پۆشاکە، ئەو شەڕ و خراپەیەش کە بۆی دروست کراوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْقَمِيصِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کراس

٦٨٢. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ أَحَبُّ الثِّيَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْقَمِيصَ.

ئوم سەلەمە ﵂ دەڵێت: خۆشەویستترین پۆشاك لای پێغەمبەری خوا ﷺ کراس بوو.

## بَابُ فِي لُبْسِ الشُّهْرَةِ

### باسێك دەربارەی لەبەرکردنی پۆشاکی ناوبانگدەرکردن

٦٨٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك خۆی بچوێنێت بە هەر قەومێك، ئەوە لەوان ئەژمار دەکرێت».

## بَابُ لِبَاسِ الْغَلِيظِ

### باسی لەبەرکردنی پۆشاکی ئەستوور

٦٨٤. عَنْ أَبِي بُرْدَةَ ﵁ قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ ﵂، فَأَخْرَجَتْ إِلَيْنَا إِزَارًا غَلِيظًا مِمَّا يُصْنَعُ بِالْيَمَنِ وَكِسَاءً مِنَ الَّتِي يُسَمُّونَهَا الْمُلَبَّدَةَ فَأَقْسَمَتْ بِاللَّهِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُبِضَ فِي هَذَيْنِ الثَّوْبَيْنِ.

ئەبو بوڕدە ﵁ دەڵێت: چووم بۆ لای عائیشە ﵂، پۆشاکێکی ئەستووری دەرهێنا

لەوانەی لە یەمەن دروست کرابوو، پۆشاکێکیش بوو کە مولەبەدەیان پێ دەگوت (واتە: پینەکراو)، سوێندی خوارد بە خوا، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم دوو پۆشاکەدا گیانی سپارد و کۆچی دوایی کرد.

## بَابٌ فِي لُبْسِ الْحَرِيرِ لِعُذْرٍ

### باسێك دەربارەی لەبەرکردنی پۆشاکی ئاوریشم بەهۆی نەخۆشییەوە

٦٨٥. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: رَخَّصَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، وَلِلزُّبَيْرِ بْنِ الْعَوَّامِ فِي قُمُصِ الْحَرِيرِ فِي السَّفَرِ مِنْ حِكَّةٍ كَانَتْ بِهِمَا.

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی دا بە عەبدورڕەحمانی کوڕی عەوف و زوبەیری کوڕی عەووام کە کراسی ئاوریشم بپۆشن لە سەفەردا، بەهۆی ئەوەی لاشەیان دەخورا (خروویەك لە لاشەیاندا پەیدا بوو، ئاوریشمیش نەرمە، ئەم خرووە ناهێڵێت، پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ئەم حاڵەتە ڕێگای پێ دان بیپۆشن).

## بَابٌ فِي الْحَرِيرِ لِلنِّسَاءِ

### باسێك دەربارەی ئاوریشم بۆ ئافرەتان (حەڵاڵە)

٦٨٦. عَن عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ أَخَذَ حَرِيرًا فَجَعَلَهُ فِي يَمِينِهِ، وَأَخَذَ ذَهَبًا فَجَعَلَهُ فِي شِمَالِهِ ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ هَذَيْنِ حَرَامٌ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پارچەیەك ئاوریشمی بە دەستی ڕاستی گرت و ئاڵتوونێکیشی بە دەستی چەپی گرت، پاشان فەرمووی: «ئەم دووانە حەرامن بۆ پیاوانی ئوممەتەکەم».

## بَابٌ فِي الْبَيَاضِ

### باسێك دەربارەی پۆشاكی سپی

٦٨٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «الْبَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ الْبَيَاضَ، فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ، وَإِنَّ خَيْرَ أَكْحَالِكُمُ الْإِثْمِدُ: يَجْلُو الْبَصَرَ، وَيُنْبِتُ الشَّعْرَ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لەنێو ڕەنگەکاندا پۆشاکی سپی لەبەر بکەن، لەبەر ئەوەی باشترین پۆشاکە و پاکە، مردووەکانیشتان بە پۆشاکی سپی کفن بکەن، باشترین ئەوەی کە چاوی پێ بڕێژن کلە (ئیسمید: کلێکە لە وڵاتی حیجاز، لە ئەصفەهان باشترین جۆری هەیە)، چاو بەهێز دەکات و ڕووناکی چاو بەهێز دەکات، برژانگیش دەڕوێنێتەوە».

٦٨٨. عَنْ أَبِي الْأَحْوَصِ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي ثَوْبٍ دُونٍ، فَقَالَ: «أَلَكَ مَالٌ؟»، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «مِنْ أَيِّ الْمَالِ؟»، قَالَ: قَدْ آتَانِي اللَّهُ مِنَ الإِبِلِ، وَالْغَنَمِ، وَالْخَيْلِ، وَالرَّقِيقِ، قَالَ: «فَإِذَا آتَاكَ اللَّهُ مَالاً فَلْيُرَ أَثَرُ نِعْمَةِ اللَّهِ عَلَيْكَ، وَكَرَامَتِهِ».

ئەبولئەحوەص، لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ بە پۆشاکێکی هەرزان و کەمبایەخەوە (لەو کاتەدا دەوڵەمەند بووم)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ماڵ و سامانت هەیە؟»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «چیت هەیە؟»، گوتی: خوا وشتر و مەڕ و بزن و مایین و ئەسپ و کۆیلە و خزمەتکاریشی پێ داوم، فەرمووی: «ئەگەر خوا ماڵێکی پێ بەخشیت، ئەوە با شوێنەواری نیعمەت و ڕێزەکەی بە سەرتەوە ببینرێت».

## بَابٌ فِي الْخُضْرَةِ

## باسێك دەربارەی ڕەنگی سەوز

٦٨٩. عَنْ أَبِي رِمْثَةَ ﷺ قَالَ: انْطَلَقْتُ مَعَ أَبِي نَحْوَ النَّبِيِّ ﷺ: فَرَأَيْتُ عَلَيْهِ بُرْدَيْنِ أَخْضَرَيْنِ.

ئەبو ریمسە ﷺ دەڵێت: لەگەڵ باوکمدا چووین بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، بینیم (پێغەمبەر ﷺ) دوو پارچە پۆشاکی سەوزی پۆشیبوون.

## بَابٌ فِي الْعَمَائِمِ

## باسێك دەربارەی مێزەرەکان



٦٩٠. عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَامَ الْفَتْحِ مَكَّةَ وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ.

جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ساڵی فەتحی مەککە، هاتە نێو مەککەوە مێزەرێکی ڕەشی لەسەردا بوو.

٦٩١. عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَلَى الْمِنْبَرِ، وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ قَدْ أَرْخَى طَرَفَهَا بَيْنَ كَتِفَيْهِ.

جەعفەری کوڕی عەمری کوڕی حوڕەیس، لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەرم ﷺ بینی لەسەر مینبەر، مێزەرێکی ڕەشی بەسەرەوە بوو، لایەکەشی شۆڕ کردبووە خوارەوە بە نێوانی هەردوو شانیدا.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِسْبَالِ الْإِزَارِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی درێژکردنەوەی پۆشاک

٦٩٢. عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ جَرَّ ثَوْبَهُ خُيَلَاءَ لَمْ يَنْظُرِ اللَّهُ إِلَيْهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ»، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ ﵁: إِنَّ أَحَدَ جَانِبَيْ إِزَارِي يَسْتَرْخِي، إِنِّي لَأَتَعَاهَدُ ذَلِكَ مِنْهُ، قَالَ: «لَسْتَ مِمَّنْ يَفْعَلُهُ خُيَلَاءَ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك بۆ لووتبەرزی شەرواڵەکەی شۆڕ بکاتەوە، لە ڕۆژی قیامەت خوا تەماشای ناکات»، ئەبو بەکر ﵁ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لایەکی شەرواڵەکەم شۆڕ دەبێتەوە (لەبەر ئەوەی ئەبو بەکر پیاوێکی لاواز بووە)، منیش چاودێری دەکەم و هەڵیدەکێشم، فەرمووی: «تۆ لەو کەسانە نیت کە بۆ لووتبەرزیت بێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْكِبْرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی لووتبەرزی

٦٩٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ كِبْرٍ، وَلَا يَدْخُلُ النَّارَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ خَرْدَلَةٍ مِنْ إِيمَانٍ».

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك تۆزقاڵێك لووتبەرزی لە دڵیدا هەبێت ناچێتە بەهەشتەوە، (هەتا سزای خۆی وەردەگرێت)، هەر کەسێکیش تۆزقاڵێك بڕوا و ئیمان لە دڵیدا هەبێت ناچێتە دۆزەخەوە».

٦٩٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ: وَكَانَ رَجُلاً جَمِيلاً، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي رَجُلٌ حُبِّبَ إِلَيَّ الْجَمَالُ، وَأُعْطِيتُ مِنْهُ مَا تَرَى، حَتَّى مَا أُحِبُّ أَنْ يَفُوقَنِي أَحَدٌ، إِمَّا قَالَ: بِشِرَاكِ نَعْلِي، وَإِمَّا قَالَ: بِشِسْعِ نَعْلِي، أَفَمِنَ الْكِبْرِ ذَلِكَ؟ قَالَ: «لَا، وَلَكِنَّ الْكِبْرَ مَنْ بَطِرَ الْحَقَّ، وَغَمَطَ النَّاسَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، پیاوێکی زۆر جوان بوو، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من پیاوێکم زۆر حەزم بە جوانی دێت، جەنابیشت دەبینی کە جوانیم پێ بەخشراوە، (بە جۆرێك پێمخۆشە و حەز بە جوانی دەکەم کە) حەز ناکەم هیچ کەسێك لە سەرووی منەوە بێت، گوتی: تەنانەت نامەوێت پەتی نەعلەکانیشی لە هیی من جوانتر بێت، جا ئایا ئەوە خۆبەزلزانینە؟ فەرمووی: «نەخێر، بەڵام خۆبەزلزانین ئەوەیە هەق وەرنەگریت و خەڵکیش بەکەم و سووك سەیر بکەیت».

## بَابٌ فِي لِبَاسِ النِّسَاءِ

### باسێك دەربارەی پۆشاکی ئافرەتان

٦٩٥. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ لَعَنَ الْمُتَشَبِّهَاتِ مِنَ النِّسَاءِ بِالرِّجَالِ، وَالْمُتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجَالِ بِالنِّسَاءِ.

ئیبن عەبباس ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی کە خۆیان دەچوێنن بە پیاوان، نەفرەتی کردووە لەو پیاوانەی کە خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتان.

## بَابٌ فِيمَا تُبْدِي الْمَرْأَةُ مِنْ زِينَتِهَا

باسێك دەربارەی ئەوەی ئاخۆ ئافرەت بۆی هەیە
چەندەی لە جوانییەکەی بەدەرەوە بێت؟

٦٩٦. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ، دَخَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَعَلَيْهَا ثِيَابٌ رِقَاقٌ، فَأَعْرَضَ عَنْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَ: «يَا أَسْمَاءُ، إِنَّ الْمَرْأَةَ إِذَا بَلَغَتِ الْمَحِيضَ لَمْ تَصْلُحْ أَنْ يُرَى مِنْهَا إِلَّا هَذَا وَهَذَا»، وَأَشَارَ إِلَى وَجْهِهِ وَكَفَّيْهِ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ﵄ (خوشکی عائیشە)، هات بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ پۆشاکێکی تەنکی لەبەردا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پشتی تێ کرد، فەرمووی: «ئەی ئەسماء، گەر ئافرەت کەوتە حەیزەوە (یانی: باڵغ بوو)، ئیدی دروست نییە هیچ شوێنێکی ببینرێت، جگە لە ئێرە و ئێرە»، ئاماژەی بۆ ڕوخسار و دەستی کرد.

## بَابٌ فِي قَوْلِهِ: {وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ} النور: ٣١

باسێك دەربارەی فەرمایشتی خوا: بە ئافرەتانی بڕوادار بڵێ
چاویان بپۆشن سەیری پیاوانی نامەحرەم نەکەن

٦٩٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: {وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ} النور: ٣١، الْآيَةَ، فَنُسِخَ، وَاسْتَثْنَى مِنْ ذَلِكَ: {وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا} النور: ٦٠، الْآيَةَ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەربارەی ئەم ئایەتە: {وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ}، دەڵێت: نەسخ بۆتەوە و ئەمە جیا کراوەتەوە: {وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللَّاتِي لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا}، واتە: ئەو ئافرەتانەی کە لەبەر پیری، یان لە حەیز

بوونەتەوە، لە منداڵبوون بوونەتەوە لەبەر گەورەییان ئومێدی هاوسەرگیرییان نییە.

تێبینی:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کەوا چەمکی (النسخ) لەلای هاوەڵان بە مانای (تخصیص العام)، یان (تقیید المطلق) هاتووە.

## بَابٌ فِي الإِنْتِعَالِ

### باسێك دەربارەی پێڵاو لەپێکردن

٦٩٨. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُحِبُّ التَّيَمُّنَ مَا اسْتَطَاعَ فِي شَأْنِهِ كُلِّهِ، فِي طُهُورِهِ وَتَرَجُّلِهِ، وَنَعْلِهِ.

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێیخۆش بووە چەندەی لە توانایدا بووایە لای ڕاست پێش بخات لە هەموو کاروبارێکی، لە دەستنوێژ شوشتن و پرچ شانەکردن و نەعل لەپێکردن (و سیواککردنی).

## بَابٌ فِي الصُّوَرِ

### باسێك دەربارەی وێنە (و وێنەکێشان)

٦٩٩. عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ، عَنْ أَبِي طَلْحَةَ الْأَنْصَارِيِّ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَا تَدْخُلُ الْمَلَائِكَةُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ، وَلَا تِمْثَالٌ»، وَقَالَ: انْطَلِقْ بِنَا إِلَى أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ عَائِشَةَ نَسْأَلُهَا عَنْ ذَلِكَ، فَانْطَلَقْنَا، فَقُلْنَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّ أَبَا طَلْحَةَ حَدَّثَنَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِكَذَا، وَكَذَا، فَهَلْ سَمِعْتِ النَّبِيَّ ﷺ يَذْكُرُ

ذَلِكَ؟ قَالَتْ: لَا، وَلَكِنْ سَأُحَدِّثُكُمْ بِمَا رَأَيْتُهُ فَعَلَ، خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ مَغَازِيهِ، وَكُنْتُ أَتَحَيَّنُ قُفُولَهُ، فَأَخَذْتُ نَمَطًا كَانَ لَنَا، فَسَتَرْتُهُ عَلَى الْعَرَضِ، فَلَمَّا جَاءَ اسْتَقْبَلْتُهُ، فَقُلْتُ: السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَعَزَّكَ وَأَكْرَمَكَ، فَنَظَرَ إِلَى الْبَيْتِ فَرَأَى النَّمَطَ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ شَيْئًا، وَرَأَيْتُ الْكَرَاهِيَةَ فِي وَجْهِهِ، فَأَتَى النَّمَطَ حَتَّى هَتَكَهُ، ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَأْمُرْنَا فِيمَا رَزَقَنَا أَنْ نَكْسُوَ الْحِجَارَةَ وَاللَّبِنَ». قَالَتْ: فَقَطَعْتُهُ وَجَعَلْتُهُ وِسَادَتَيْنِ، وَحَشَوْتُهُمَا لِيفًا، فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَيَّ.

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی لە ئەبو تەڵحەی ئەنصاری ﷺ گوتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو دەیفەرموو: «فریشتە ناچێتە ماڵێك سەگ و پەیکەری تێدابێت»، گوتی: با بڕۆین بۆلای دایکی بڕواداران عائیشە ﷺ دەربارەی ئەم فەرموودەیە پرسیاری لێ بکەین، چووین بۆ لای گوتمان: ئەی دایکی بڕواداران ئەبو تەلحە ئەم فەرموودەیەمان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ئاوا و ئاوا بۆ دەگێڕێتەوە، ئایا تۆ شتی وات لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستووە؟ گوتی: نەخێر، بەڵام شتێکتان بۆ باس دەکەم خۆم بینیومە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ یەکێك لە غەزاکانی و منیش چاوەڕێی گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم، ڕاخەرێکی ناسك و تەنکمان هەبوو هێنام بەسەر ئەو دارڕایەڵەم دادا، کە هاتەوە پێشوازیم لێ کرد گوتم: سڵاوی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا، سوپاس بۆ خوا کە سەری خستی و ڕێزی گرتی، ئەویش سەیری ماڵەکەی کرد و ئەو پەردەیەی بینی، وەڵامی نەدامەوە، پێناخۆشبوونم بە نێوچاوانیدا بینی، هات پەردەکەی لابرد و دڕاندی، پاشان فەرمووی: خوا ئەو شتەی بە ئێمەی بەخشیوە فەرمانی پێ نەکردووین پۆشاك بۆ دار و بەرد بکەین، دەڵێت: منیش پارچە پارچەم کرد، کردمە دوو ڕاخەر، پووشی دارخورمام کردە نێوی وەکوو ڕاخەر بەکارم هێنا، ئەوکاتە نکووڵی نەکرد.

٧٠٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: حَدَّثَتْنِي مَيْمُونَةُ ﷺ، زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ

قَالَ: «إِنَّ جِبْرِيلَ عليه السلام كَانَ وَعَدَنِي أَنْ يَلْقَانِي اللَّيْلَةَ، فَلَمْ يَلْقَنِي»، ثُمَّ وَقَعَ فِي نَفْسِهِ جَرْوُ كَلْبٍ تَحْتَ بِسَاطٍ لَنَا، فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ، ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِهِ مَاءً فَنَضَحَ بِهِ مَكَانَهُ، فَلَمَّا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ عليه السلام قَالَ: إِنَّا لَا نَدْخُلُ بَيْتًا فِيهِ كَلْبٌ وَلَا صُورَةٌ.

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: مەیموونە رضي الله عنها خێزانی پێغەمبەر ﷺ پێی ڕاگەیاندم پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «جیبریل عليه السلام بەڵێنی دا ئەمشەو بێت بۆ لام، بەڵام نەهات و یەکدیمان نەبینی»، دوایی دڵی پێغەمبەر ﷺ هەستی کرد کە توتکە سەگێکی بچووك لەژێر ڕاخەرێکدایە، بۆیە جیبریل عليه السلام نەهاتووە، بۆیە فەرمانی کرد دەرکرا، دوایی بە دەستیشی ئەو شوێنەی ئاوپڕژێن کرد، ئینجا بە جیبریل عليه السلام گەیشت، فەرمووی: ئێمە ناچینە ماڵێکەوە کە سەگ یان وێنەی تێدا بێت.

تێبینی:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شوێنێك سەگی لێ بخەوێت، بە ئاوپڕژێن خاوێن دەبێتەوە، وێنەکەش وەك زانایان باسیان کردووە زیاتر مەبەست پێی پەیکەری بت و صەنەم پیاوچاکانی پێشووە کە دوای خۆیان وەك پەرستراو مامەڵەیان لەگەڵ دەکرا.

٧٠١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَانِي جِبْرِيلُ عليه السلام، فَقَالَ لِي: أَتَيْتُكَ الْبَارِحَةَ فَلَمْ يَمْنَعْنِي أَنْ أَكُونَ دَخَلْتُ إِلَّا أَنَّهُ كَانَ عَلَى الْبَابِ تَمَاثِيلُ، وَكَانَ فِي الْبَيْتِ قِرَامُ سِتْرٍ فِيهِ تَمَاثِيلُ، وَكَانَ فِي الْبَيْتِ كَلْبٌ، فَمُرْ بِرَأْسِ التِّمْثَالِ الَّذِي فِي الْبَيْتِ يُقْطَعُ، فَيَصِيرُ كَهَيْئَةِ الشَّجَرَةِ، وَمُرْ بِالسِّتْرِ فَلْيُقْطَعْ، فَلْيُجْعَلْ مِنْهُ وِسَادَتَيْنِ مَنْبُوذَتَيْنِ تُوطَآنِ، وَمُرْ بِالْكَلْبِ فَلْيُخْرَجْ»، فَفَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَإِذَا الْكَلْبُ لِحَسَنٍ -أَوْ حُسَيْنٍ- رضي الله عنهما كَانَ تَحْتَ نَضَدٍ لَهُمْ، فَأَمَرَ بِهِ فَأُخْرِجَ. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَالنَّضَدُ: شَيْءٌ تُوضَعُ عَلَيْهِ الثِّيَابُ شَبَهُ السَّرِيرِ.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «جیبریل ﷺ هات گوتی: دوێنی هاتم بۆلات، بەڵام ئەوەی ڕێگری لێ کردم کە بێمە ژوورەوە بۆلات ئەوە بوو، دەرگاکە پەیکەری تێدا بوو،ماڵیش پەردەیەکی تێدا بوو کە وێنەی پەیکەری تێدا بوو، سەگێکیش لە ماڵەوە بووە، فەرمان بکە ئەو پەیکەرەی کە لەلای دەرگای ماڵەوەیە با سەری لێ بکرێتەوە، کە سەری نەما ئیدی بە پەیکەر و وێنە دانانرێت، وەکوو داری لێ دێت، وە پەردەکەش با بدڕێنرێت و بکرێتە دوو ڕاخەر ڕایبخەن، با دابنرێت و پێی بەسەردا بنرێت، فەرمان بکە با سەگەکەش لە ماڵ دەربکرێت»، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەی جێبەجێ کرد، بەڵام سەیر دەکەن سەگەکە سەگی حەسەن یان حوسەین ﷺ بووە، کە لەژێر مێزێك بووە کە جێگایان لەسەری داناوە, بۆیە فەرمان بە دەرکردنی کرا و دەرکرا. ئەبو داود دەڵێت: (النَّضَدُ) شتێکە پۆشاك و شتی لەسەر دادەنرێت وەکوو جێگا.

# كِتَابُ التَّرَجُّلِ

## پەرتووکی پرچ و قژ داهێنان

٧٠٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﵁ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ التَّرَجُّلِ إِلَّا غِبًّا.

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پرچداهێنانی (بەبەردەوامی) ڕێگریی لێ کردووە، تەنها جار جار (ڕێگەی پێ داوە دابهێنرێت).

تێبینی:

واتە نابێت زێدەڕۆیی بکرێت و مرۆڤ هەر خەریکی خۆڕازاندنەوە و ڕابواردن بێت، بەڵکوو بەگوێرەی پێویست، بای ئەوەندە کە سەر و پرچ خاوێن و ڕێکوپێک بێت و ئاڵۆز و بڵۆز نەبێت بەسیەتی، ئەگەرنا خزمەتکردنی سەر و قژ فەرمانی پێ کراوە و یەکێکە لە سوننەتەکان.

(التَّرَجُّل): واتە: سەرداهێنان و خاوێنڕاگرتنی و جوانکردنی.

(غبًّا): واتە: ڕۆژێك نا ڕۆژێك ئەنجامدانی کارێك.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي اسْتِحْبَابِ الطِّيبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پەسندیی بۆنیخۆش

٧٠٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: كَانَتْ لِلنَّبِيِّ ﷺ سُكَّةٌ يَتَطَيَّبُ مِنْهَا.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ شووشەیەکی هەبووە کە بۆنی تێدا بووە و لەو شووشەیەوە خۆی بۆنخۆش کردووە.

## بَابٌ فِي إِصْلَاحِ الشَّعَرِ

### باسێك دەربارەی ڕێکخستنی قژ و پرچ

٧٠٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ كَانَ لَهُ شَعْرٌ فَلْيُكْرِمْهُ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك قژی هەبوو، با خزمەتی بکات و ڕێزی بگرێت».

## بَابٌ فِي رَدِّ الطِّيبِ

### باسێك دەربارەی ڕەتکردنەوەی بۆنی خۆش

٧٠٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ عُرِضَ عَلَيْهِ طِيبٌ فَلَا يَرُدَّهُ، فَإِنَّهُ طَيِّبُ الرِّيحِ، خَفِيفُ الْمَحْمَلِ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك بۆنیان پێی دا با ڕەتی نەکاتەوە، چونکە بۆنی خۆشە و هەڵگرتنیشی ئاسانە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمَرْأَةِ تَتَطَيَّبُ لِلْخُرُوجِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئافرەت
### کە بۆ دەرچوون لە ماڵ بۆن لە خۆی بدات

٧٠٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ أَصَابَتْ بَخُورًا، فَلَا تَشْهَدَنَّ مَعَنَا الْعِشَاءَ». قَالَ ابْنُ نُفَيْلٍ: عِشَاءَ الْآخِرَةِ

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر ئافرەتێك بۆنی بخووری لە خۆی دا (یان هەر بۆنێك بێت کە بۆنی بڕوات)، با ئامادەی نوێژی عیشا نەبێت لەگەڵ ئێمەدا». ئیبن نوفەیل دەڵێت: مەبەست نوێژی خەوتنانە.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الشَّعَرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قژ و پرچ

٧٠٧. عَنِ الْبَرَاءِ ﵁ قَالَ: مَا رَأَيْتُ مِنْ ذِي لِمَّةٍ أَحْسَنَ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

بەڕاء ﵁ دەڵێت: هیچ کەسێکم نەبینیوە کە قژەکەی شۆڕ بووبێتەوە، بەڵام نەگاتە شانی و پۆشاکێکی سووری پۆشیبێت جوانتر لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

٧٠٨. عَنِ الْبَرَاءِ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَهُ شَعْرٌ يَبْلُغُ شَحْمَةَ أُذُنَيْهِ.

بەڕاء ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قژی هەبوو دەگەیشتە نەرمایی گوێیەکانی.

## بَابٌ فِي حَلْقِ الرَّأْسِ

### باسێك دەربارەی سەرتاشین

٧٠٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ جَعْفَرٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمْهَلَ آلَ جَعْفَرٍ ثَلَاثًا أَنْ يَأْتِيَهُمْ، ثُمَّ أَتَاهُمْ، فَقَالَ: «لَا تَبْكُوا عَلَى أَخِي بَعْدَ الْيَوْمِ»، ثُمَّ قَالَ: «ادْعُوا لِي بَنِي أَخِي»، فَجِيءَ بِنَا كَأَنَّا أَفْرُخٌ، فَقَالَ: «ادْعُوا لِي الْحَلَّاقَ»، فَأَمَرَهُ فَحَلَقَ رُءُوسَنَا.

عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ مۆڵەتی دا بە کەسوکاری جەعفەر (کە جەعفەر شەهید بوو) سێ ڕۆژ تازیەبار بن، دوای سێیەم ڕۆژ هات بۆلایان، فەرمووی: «لەدوای ئەمڕۆوە بۆ جەعفەری برام مەگرین» (جەعفەر ئامۆزای بوو)، دوایی فەرمووی: «برازاکانم بۆ بانگ بکەن» (کە سێ کوڕی هەبوو: عەبدوڵڵا، عەون، موحەممەد)، (ڕاوی کە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرە) دەڵێت: ئێمەیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ وەکوو بێچووی باڵندە وا بووین قژمان درێژ بوو، فەرمووی: «بانگی سەرتاشم بۆ بکەن»، فەرمانی پێ کرد سەرمانی تاشی.

## بَابٌ فِي أَخْذِ الشَّارِبِ

### باسێك دەربارەی کورتکردنەوەی سمێڵ

٧١٠. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: وَقَّتَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَلْقَ الْعَانَةِ، وَتَقْلِيمَ الْأَظْفَارِ، وَقَصَّ الشَّارِبِ، وَنَتْفَ الْإِبِطِ، أَرْبَعِينَ يَوْمًا مَرَّةً.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ تاشین و لابردنی مووی دامێن و نینۆككردن و کورتکردنەوەی سمێڵ و هەڵکەندنی مووی بنباڵ کاتی بۆ دیاری کردین، (کە کاتەکە بەو جۆرە بوو) هەر چل ڕۆژێك جارێك (ئەو کارە بکەن).

✍ تێبینی:

دیارە کە ئەوە لایەنی زۆریەتی، ئەگەرنا وا باشترە زوو زوو ئەو خاوێنکارییە بکرێت، هەر نەبێت هەفتەی جارێك.

## بَابٌ فِي الْخِضَابِ

### باسێك دەربارەی ڕەنگکردنی سەر و ڕیش

٧١١. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَحْسَنَ مَا غُيِّرَ بِهِ هَذَا الشَّيْبُ الْحِنَّاءُ، وَالْكَتَمُ».

ئەبو زەڕ ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترین شتێك کە سەر و ڕیشی سپی پێ بگۆڕدرێت خەنە و وسمەیە».

✍ تێبینی:

(الْحِنَّاء): جۆرە گیایەکە ڕەنگەکەی سوورە (خەنە).

(الْكَتَم): جۆرە گیایەکە ڕەنگی ڕەشی لێ دروست دەکرێت، ئەگەر حەناء و کەتم تێکەڵ بکرێت ڕەنگەکە لە نێوان ڕەش و سووردا دەبێت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي خِضَابِ السَّوَادِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەنگکردن بە ڕەنگی ڕەش

٧١٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَكُونُ قَوْمٌ يَخْضِبُونَ فِي آخِرِ الزَّمَانِ بِالسَّوَادِ، كَحَوَاصِلِ الْحَمَامِ، لَا يَرِيحُونَ رَائِحَةَ الْجَنَّةِ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کەسانێك لە کۆتایی زەماندا پەیدا دەبن سەر و ڕیشیان ڕەنگ دەکەن بە ڕەش وەکوو پەڕی سەر سینگی کۆتر (کە بە شێوازێکی گشتی ڕەشە)، ئەمانە بۆنی بەهەشت ناکەن».

✎ تێبینی:

ئەم فەرموودەیە نابێتە بەڵگە لەسەر حەرامی ڕەنگی ڕەش، بەڵکوو بەڵگەیە بۆ ناسینەوەی یەکێك لە سیفەتەکانی ئەو کەسانە، چونکە ئاماژەی تێدا نییە کە بەهۆی ڕەنگە ڕەشەکەوە دەچنە دۆزەخ!

# كِتَابُ الْخَاتَمِ

## پەرتووكی ئەنگوستیلە (ی پێغەمبەر ﷺ)

### بَابُ مَا جَاءَ فِي اتِّخَاذِ الْخَاتَمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی لەپەنجەكردنی ئەنگوستیلە

٧١٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: أَرَادَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يَكْتُبَ إِلَى بَعْضِ الْأَعَاجِمِ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّهُمْ لَا يَقْرَءُونَ كِتَابًا إِلَّا بِخَاتَمٍ، فَاتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ، وَنَقَشَ فِيهِ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ.

ئەنەسی كوڕی مالیك رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی نامە بنێرێت بۆ هەندێك لە پاشاكانی غەیری عەرەب (وەك: كیسرا و قەیسەر و ... هتد)، گوتیان: ئەوان هیچ نامەیەك ناخوێننەوە ئەگەر مۆری لەسەر نەبێت، ئەویش ئەنگوستیلەیەكی دروست كرد لە زیو نەقشەكەی: محمد رسول الله بوو.

٧١٤. عن أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ خَاتَمُ النَّبِيِّ ﷺ مِنْ وَرِقٍ فَصُّهُ حَبَشِيٌّ.

ئەنەس رضي الله عنه دەڵێت: ئەنگوستیلەی پێغەمبەر ﷺ لە زیو بوو، وەستاكەی حەبەشی

بوو، یان بە شێوازێکی حەبەشی دروست کرابوو.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرْكِ الْخَاتَمِ

### باسی وازهێنان لە ئەنگوستیلە

٧١٥. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّهُ رَأَى فِي يَدِ النَّبِيِّ ﷺ خَاتَمًا مِنْ وَرِقٍ يَوْمًا وَاحِدًا، فَصَنَعَ النَّاسُ، فَلَبِسُوا، وَطَرَحَ النَّبِيُّ ﷺ، فَطَرَحَ النَّاسُ.

ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: یەك ڕۆژ لە دەستی پێغەمبەر ﷺ ئەنگوستیلەیەکی بینیوە لە زیو، خەڵکیش لە زیو دروستیان کرد، دوایی پێغەمبەر ﷺ فڕێی دا و خەڵکەکەش فڕێیان دا.

تێبینی:

زانایانی فەرموودەناس دەڵێن: ئەو ئەنگوستیلەیەی پێغەمبەر ﷺ فڕێی داوە و هاوەڵانیش فڕێیان داوە لە زێڕ بووە، دواتر ئەنگوستیلەیەکی زیوی بۆ کاروباری نامەناردن و مۆر و ئیمزا لەدەست کردووە.

# كِتَابُ الْفِتَنِ وَالْمَلَاحِمِ

## پەرتووکی ئاشووبەکان و جەنگ و کوشتار

### بَابُ ذِكْرِ الْفِتَنِ وَدَلَائِلِهَا

### باسی ئاشووبەکان و بەڵگەکانی

٧١٦. عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁ قَالَ: قَامَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَائِمًا، فَمَا تَرَكَ شَيْئًا يَكُونُ فِي مَقَامِهِ ذَلِكَ إِلَى قِيَامِ السَّاعَةِ إِلَّا حَدَّثَهُ، حَفِظَهُ مَنْ حَفِظَهُ، وَنَسِيَهُ مَنْ نَسِيَهُ، قَدْ عَلِمَهُ أَصْحَابُهُ هَؤُلَاءِ، وَإِنَّهُ لَيَكُونُ مِنْهُ الشَّيْءُ، فَأَذْكُرُهُ كَمَا يَذْكُرُ الرَّجُلُ وَجْهَ الرَّجُلِ إِذَا غَابَ عَنْهُ، ثُمَّ إِذَا رَآهُ عَرَفَهُ.

حوزەیفە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێوماندا هەستا و وتارێکی دا، لەو شوێنەدا هیچ شتێك نەما کە باسی نەکات ئەوەی ڕوو دەدات تاکوو ڕۆژی کۆتایی دونیا، ئەوەی لەبەری کرد ئەو بەبیری ماوە و ئەوەیشی لەبیری کرد ئەوە لەبیری چۆتەوە، بێگومان ئەو هاوەڵانەی کە لەوێ بوون هەموویان ئەوە دەزانن، جاریش هەیە من شتێکم لەو شتانە لەبیر چۆتەوە، بەڵام (کاتێك ڕووداوەکە دەبینم) یەکسەر بەبیرم دێتەوە، هەر وەکوو چۆن پیاوێك ماوەیەك پیاوێك نابینێت، بەڵام هەر کە بینیی یەکسەر دەیناسێتەوە.

٧١٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ ﷺ يَقُولُ: كُنَّا قُعُودًا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ، فَذَكَرَ الْفِتَنَ فَأَكْثَرَ فِي ذِكْرِهَا حَتَّى ذَكَرَ فِتْنَةَ الْأَحْلَاسِ، فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا فِتْنَةُ الْأَحْلَاسِ؟ قَالَ: «هِيَ هَرَبٌ وَحَرْبٌ، ثُمَّ فِتْنَةُ السَّرَّاءِ، دَخَنُهَا مِنْ تَحْتِ قَدَمَيْ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يَزْعُمُ أَنَّهُ مِنِّي، وَلَيْسَ مِنِّي، وَإِنَّمَا أَوْلِيَائِي الْمُتَّقُونَ، ثُمَّ يَصْطَلِحُ النَّاسُ عَلَى رَجُلٍ كَوَرِكٍ عَلَى ضِلَعٍ، ثُمَّ فِتْنَةُ الدُّهَيْمَاءِ، لَا تَدَعُ أَحَدًا مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ إِلَّا لَطَمَتْهُ لَطْمَةً، فَإِذَا قِيلَ: انْقَضَتْ، تَمَادَتْ يُصْبِحُ الرَّجُلُ فِيهَا مُؤْمِنًا، وَيُمْسِي كَافِرًا، حَتَّى يَصِيرَ النَّاسُ إِلَى فُسْطَاطَيْنِ، فُسْطَاطِ إِيمَانٍ لَا نِفَاقَ فِيهِ، وَفُسْطَاطِ نِفَاقٍ لَا إِيمَانَ فِيهِ، فَإِذَا كَانَ ذَاكُمْ فَانْتَظِرُوا الدَّجَّالَ، مِنْ يَوْمِهِ، أَوْ مِنْ غَدِهِ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، ئەویش باسی ئاشووب و ئاژاوەی کرد (کە لەمەودوا سەر هەڵدەدات)، ئیدی زۆر باسی کرد، هەتا گەیشتە ئەوەی باسی فیتنەی ئەحلاسی کرد، یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، فیتنەی ئەحلاس چییە؟ فەرمووی: «ئەوەیە کە خەڵکی لەبەر یەکدی ڕادەکەن و هەڵدێن (چونکە دوژمنایەتی و شەڕ لە نێوانیاندا هەیە)، هەروەها ماڵڕفاندن و دزی و تاڵان سەر هەڵدەدات، پاشان بەڵای دیکە سەر هەڵدەدات، (السراء) کە دووکەڵەکەی لەژێر پێیەکانی پیاوێك دێتەدەر کە پێی وایە لە خانەوادەی منە، لە کاتێکدا لە بنەماڵەکەی منیش نییە، چونکە لە ڕاستیدا تەنها ئەوانەی لەخواترسن دۆستی منن، پاشان خەڵکی لەسەر کەسێك ڕێك دەکەون، وەکوو ئەوە وایە گۆشتی ڕانی بخەیتە سەر ئێسقانی پەراسوو (ئێسکی پەراسووش توانای هەڵگرتنی گۆشتی ڕانی نییە)، پاشان ئاشووبێکی ڕەش و تاریك سەر هەڵدەدات (لەبەر گەورەیی ئاشووبەکە بە ڕەش و تاریك ناوی بردووە)، هیچ کەسێك نامێنێت کە پڕشکی ئەو ئاگرەی بەرنەکەوێت، جا هەر کات گوتیان: شەڕ و ئاژاوە کۆتایی هات، دیسان سەر هەڵدەداتەوە، بە جۆرێك پیاو هەیە بەیانییەکەی بڕوادارە ئێوارە بە کافری دەکاتەوە، هەتا وای لێ دێت خەڵکی دەبنە دوو تاقم، تاقمێکیان باوەڕداری

تەواون و دووڕوویی لەنێویاندا بوونی نییە، تاقمێکیش دووڕووی یەکلابووەن و بڕوا و ئیمان لەنێویاندا بوونی نییە، جا هەر کات ئەوە ڕووی دا، ئیدی چاوەڕێی دەججال بکەن لەو ڕۆژەدا یان بەیانییەکەی».

٧١٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُوشِكُ الْمُسْلِمُونَ أَنْ يُحَاصَرُوا إِلَى الْمَدِينَةِ، حَتَّى يَكُونَ أَبْعَدَ مَسَالِحِهِمْ سَلَاحِ».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نزیکە موسوڵمانان لە مەدینەدا گەمارۆ بدرێن (بەهۆی دوژمن پەنا بۆ ئەوێ ببەن)، بە جۆرێك کە دوورترین سەنگەر لە خۆیانەوە لە سەلاح دەبێت».

تێبینی:



(سلاح): شوێنێکە لە نزیك خەیبەر.

## بَابٌ فِي النَّهْيِ عَنِ السَّعْيِ فِي الْفِتْنَةِ

باسێك دەربارەی ڕێگریکردن لە هەوڵدان بۆ هەڵگیرساندنی شەڕ و ئاژاوە

٧١٩. عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتْنَةٌ يَكُونُ الْمُضْطَجِعُ فِيهَا خَيْرًا مِنَ الْجَالِسِ، وَالْجَالِسُ خَيْرًا مِنَ الْقَائِمِ، وَالْقَائِمُ خَيْرًا مِنَ الْمَاشِي، وَالْمَاشِي خَيْرًا مِنَ السَّاعِي»، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: «مَنْ كَانَتْ لَه إِبِلٌ، فَلْيَلْحَقْ بِإِبِلِه، وَمَنْ كَانَتْ لَهُ غَنَمٌ، فَلْيَلْحَقْ بِغَنَمِهِ، وَمَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَلْحَقْ بِأَرْضِهِ»، قَالَ: فَمَنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ؟ قَالَ: «فَلْيَعْمِدْ إِلَى سَيْفِهِ، فَلْيَضْرِبْ بِحَدِّهِ عَلَى حَرَّةٍ، ثُمَّ لِيَنْجُ مَا اسْتَطَاعَ النَّجَاءَ».

ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئاشووب ڕوو دەدات

ئەوەی ڕاکشاوە باشترە لەوەی دانیشتووە ئەوەی دانیشتووە باشترە لەوەی کە بەپێوەیە، ئەوەی بەپێوە ڕاوەستاوە باشترە لەوەی کە بەپێوە دەڕوات، ئەوەی کە بەپێ دەڕوات باشترە لەوەی کە هەوڵی بۆ دەدات»، (ئەبو بەکرە) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمانم بە چ پێ دەکەیت؟ فەرمووی: «ئەوەی وشتری هەیە دوای وشترەکانی بکەوێت (دوورکەوێتەوە لە ئاوەدانی)، ئەوەی مەڕ و بزنی هەیە با دوای مەڕ و بزنی بکەوێت (دوورکەوێتەوە لە ئاوەدانی)، ئەوەی زەوییەکی هەیە لەو دەشتە با بڕوات خەریکی زەویوزاری خۆی بێت»، گوتی: ئەی ئەگەر کەسێك هیچ لەم شتانەی نەبوو؟ فەرمووی: «با نووکی شمشێرەکەی و تیژایی شمشێرەکەی لە بەردێك بدات (تاکوو بەشداری فیتنەکە نەبێت)، پاشان هەوڵ بدات بەپێی توانا خۆی ڕزگار بکات».

## بَابُ فِي تَعْظِيمِ قَتْلِ الْمُؤْمِنِ



### باسێك دەربارەی گەورەیی تاوانی کوشتنی بڕوادار

٧٢٠. عَنْ خَالِدِ بْنِ دِهْقَانَ قَالَ: كُنَّا فِي غَزْوَةِ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ بِذُلُقْيَةَ، فَأَقْبَلَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ فِلَسْطِينَ مِنْ أَشْرَافِهِمْ وَخِيَارِهِمْ، يَعْرِفُونَ ذَلِكَ لَهُ، يُقَالُ لَهُ: هَانِئُ بْنُ كُلْثُومِ بْنِ شَرِيكٍ الْكِنَانِيُّ، فَسَلَّمَ عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي زَكَرِيَّا، وَكَانَ يَعْرِفُ لَهُ حَقَّهُ، قَالَ لَنَا خَالِدٌ: فَحَدَّثَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِي زَكَرِيَّا، قَالَ: سَمِعْتُ أُمَّ الدَّرْدَاءِ تَقُولُ: سَمِعْتُ أَبَا الدَّرْدَاءِ ﵁ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «كُلُّ ذَنْبٍ عَسَى اللَّهُ أَنْ يَغْفِرَهُ، إِلَّا مَنْ مَاتَ مُشْرِكًا، أَوْ مُؤْمِنٌ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا».

خالیدی کوڕی دیهقان دەڵێت: لە غەزای قوستەنتینییە بووین لە شاری زولقییە (شارێکی ڕۆمییەکان بوو)، پیاوێك لە باشترین و چاکترینی خەڵکی فەلەستین هات، دەیانزانی کە ئەم پیاوە چەند کەسێکی بەڕێز و چاکە، ناویشی هانیئی کوڕی کولسومی کوڕی شەریکی کینانی بوو، سەلامی لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو زەکەریا

کرد، ئەویش ئەم پیاوەی دەناسی کە چەند بەڕێزە، خالید پێی گوتین: عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو زەکەریا ئەم فەرموودەیەی بۆ گێڕاینەوە دەڵێت: گوێم لە ئوم دەرداء بووە، دەڵێت: گوێم لە ئەبو دەرداء ﵁ بووە دەیگوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەموو تاوانێك ئومێد دەکرێت خوا لێی خۆش بێت، تەنها ئەگەر کەسێك مردبێت و هاوبەشی بۆ خوا دانابێت، خوا هەرگیز لێی خۆش نابێت، یان بڕوادارێك بڕوادارێکی کوشتبێت بەئەنقەست».

٧٢١. عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ ﵄ فَقَالَ: لَمَّا نَزَلَتِ الَّتِي فِي الْفُرْقَانِ: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ، وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ} الفرقان: ٦٨، قَالَ مُشْرِكُو أَهْلِ مَكَّةَ: قَدْ قَتَلْنَا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ، وَدَعَوْنَا مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ، وَأَتَيْنَا الْفَوَاحِشَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: {إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ} الفرقان: ٧٠، فَهَذِهِ لِأُولَئِكَ، قَالَ: وَأَمَّا الَّتِي فِي النِّسَاءِ: {وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ} النساء: ٩٣، الْآيَةَ، قَالَ: الرَّجُلُ إِذَا عَرَفَ شَرَائِعَ الْإِسْلَامِ، ثُمَّ قَتَلَ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا، فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ لَا تَوْبَةَ لَهُ، فَذَكَرْتُ هَذَا لِمُجَاهِدٍ، فَقَالَ: إِلَّا مَنْ نَدِمَ.

سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێت: پرسیارم لە ئیبن عەبباس ﵄ کرد، گوتی: کە ئەم ئایەتەی فورقان دابەزی: {وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ، وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ}، هاوبەشدانەرانی ئەهلی مەککە گوتیان: (ئەم تاوانانە ئێمە هەموومان کردووە)، خەڵکمان بەناهەق کوشتووە، هاوبەشمان بۆ خوا داناوە، زینامان کردووە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دیکەی دابەزاند: {إِلَّا مَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ}، واتە: مەگەر کەسێك تەوبە بکات و بڕوابێنێت و کردەوەی چاك بکات خوا خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێت بە چاکە. دەڵێت: ئەم ئایەتە بۆ کافرانە (ئەمە بۆ ئەهلی شیرك دابەزیوە)،

بەڵام ئایەتەکەی النساء: {وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا فَجَزَاؤُهُ جَهَنَّمُ}، دەڵێت: کەسێك یاسا و ڕێساکانی ئیسلام بزانێت و ئەوجار بڕوادارێك بکوژێت بەناهەق و بەئەنقەست، ئەوە دەچێتە دۆزەخەوە تەوبەی بۆ نییە، ئەمەم باس کرد بۆ موجاهید، موجاهید گوتی: مەگەر کەسێك تەوبە بکات (ئەوکات خوا لێی خۆش دەبێت، ئەگەر تەوبە نەکات خوا لێی خۆش نابێت).

# كِتَابُ الْمَهْدِيِّ[1]

## پەرتووكی مەهدیی

٧٢٢. عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَزَالُ هَذَا الدِّينُ عَزِيزًا إِلَى اثْنَيْ عَشَرَ خَلِيفَةً»، قَالَ: فَكَبَّرَ النَّاسُ وَضَجُّوا، ثُمَّ قَالَ كَلِمَةً خَفِيفَةً، قُلْتُ لِأَبِي: يَا أَبَتِ، مَا قَالَ؟ قَالَ: «كُلُّهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ».

جابیری كوڕی سەمورە ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «ئەم دینە هەمیشە بەبەهێزی و شكۆمەندی دەمێنێتەوە هەتاكوو دوازدە جێنشین (خەلیفە)»، گوتی: خەڵكەكە دەستیان كرد بە (الله أكبر) كردن و هاواریان كرد، پاشان (پێغەمبەر ﷺ) بەچرپەوە قسەیەكی فەرموو، (ڕاوی دەڵێت:) بە باوكم گوت: ئەرێ باوكە، چی فەرموو؟ (گوتی:) فەرمووی: «هەموو خەلیفەكان لە قورەیشن».

٧٢٣. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَوْ لَمْ يَبْقَ مِنَ الدَّهْرِ إِلَّا يَوْمٌ، لَبَعَثَ اللَّهُ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ بَيْتِي، يَمْلَؤُهَا عَدْلًا كَمَا مُلِئَتْ جَوْرًا».

عەلی ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «ئەگەر تەنها ڕۆژێك لە

---

(١) باسی موحەممەدی مەهدی كە پیاوێكی صالحە، لە نەوەی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە كۆتایی زەماندا دەردەكەوێت و دەججالیش لەدوای ئەو دێت و نیشانەكانی دیكەی قیامەت دێن، عیساش دادەبەزێت دەججال دەكوژێت و لەپشت مەهدییەوە نوێژ دەكات، چەند فەرموودەیەك لەم بارەیەوە هاتووە.

ڕۆژگار مابێت، (ئا لەو ڕۆژەدا بێگومان دەبێت ئەم شتە ڕوو بدات)، حەتمەن دەبێت خوا پیاوێکی لە ئال و بەیتی من ناردووە، سەر زەوی پڕ دەکات لە دادگەری، هەر وەکوو چۆن پێش ئەوە پڕ بووە لە ستەم و خراپەکاری».

٧٢٤. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الْمَهْدِيُّ مِنْ عِتْرَتِي، مِنْ وَلَدِ فَاطِمَةَ».

ئوم سەلەمە ﵂ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «مەهدی لە نەوەی منە، لە نەوەی فاتیمەیە».

٧٢٥. عَنْ هِلَالِ بْنِ عَمْرٍو، قَالَ: سَمِعْتُ عَلِيًّا ﵁ يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَخْرُجُ رَجُلٌ مِنْ وَرَاءِ النَّهْرِ يُقَالُ لَهُ: الْحَارِثُ بْنُ حَرَّاثٍ، عَلَى مُقَدِّمَتِهِ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ: مَنْصُورٌ، يُوَطِّئُ - أَوْ يُمَكِّنُ - لِآلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا مَكَّنَتْ قُرَيْشٌ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَجَبَ عَلَى كُلِّ مُؤْمِنٍ نَصْرُهُ»، أَوْ قَالَ: «إِجَابَتُهُ».



هیلالی کوڕی عەمر، دەڵێت: گوێم لە پێشەوا عەلی ﵁ بوو دەیگوت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «پیاوێك لە پشت ڕووبارەکانەوە (وەك: بوخارا و سەمەرقەند) دەردەچێت پێی دەگوترێت: حاریسی کوڕی حەڕڕاس، (ئەوەی زەرعات دەکات)، لە پێشەوەی سوپاکەی پیاوێکی لێیە ناوی مەنصوورە، ماڵ و سەروەت و سامان و چەکی دەخاتە خزمەت خەلافەتەکەی موحەممەدی مەهدییەوە (بەهێزی دەکات و یارمەتی دەدات)، وەکوو چۆن بڕوادارانی قورەیش یارمەتی پێغەمبەری خوایان ﷺ دا و بەرگرییان لێ کرد، پێویستە لەسەر هەموو بڕوادارێك ئەو حاریسە سەر بخات، یان ئەو مەنصوورە سەر بخات (یان موحەممەدی مەهدی سەر بخات، جیاوازییان نییە هەموویان هەر یەکن)، یان وەڵامی بداتەوە».

# كِتَابُ الْمَلَاحِمِ

## پەرتووكی داستانەكان ( شەڕی گەورە)

### بَابُ مَا يُذْكَرُ فِي قَرْنِ الْمِائَةِ

#### ئەوەی باس كراوە لە سەد ساڵ (جارێك خوا تازەكەرەوەی ئایینەكەی دەنێرێت)

٧٢٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُ لِهَذِهِ الْأُمَّةِ عَلَى رَأْسِ كُلِّ مِائَةِ سَنَةٍ مَنْ يُجَدِّدُ لَهَا دِينَهَا».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «خوا هەر سەد ساڵێك كەسێك دەنێرێت بۆ ئەم ئوممەتە كە ئایینەكەی بۆ تازە بكاتەوە».

### بَابُ فِي أَمَارَاتِ الْمَلَاحِمِ

#### باسێك دەربارەی نیشانەكانی شەڕە گەورەكە

٧٢٧. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عُمْرَانُ بَيْتِ الْمَقْدِسِ خَرَابُ يَثْرِبَ، وَخَرَابُ يَثْرِبَ خُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ، وَخُرُوجُ الْمَلْحَمَةِ فَتْحُ قُسْطَنْطِينِيَّةَ،

وَفَتْحُ الْقُسْطَنْطِينِيَّةِ خُرُوجُ الدَّجَّالِ»، ثُمَّ ضَرَبَ بِيَدِهِ عَلَى فَخِذِ الَّذِي حَدَّثَهُ، - أَوْ مَنْكِبِهِ - ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ هَذَا لَحَقٌّ كَمَا أَنَّكَ هَاهُنَا»، أَوْ « كَمَا أَنَّكَ قَاعِدٌ»، يَعْنِي مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ.

موعازی کوڕی جەبەل ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئاوەدانکرانەوەی بەیتولمەقدیس (بەهۆی ئەوەی خەڵك زۆر ڕووی تێ دەکات)، ئەمە وێرانبوونی مەدینەیە، وێرانبوونی مەدینەش دەرچوونی شەڕ و جەنگە گەورەکەیە، کە شەڕە گەورەکە دەستی پێ کرد فەتحی قوستەنتینییە دەکەن، دوای فەتحی قوستەنتینییەش دەرچوونی دەججالە، دونیا تێك دەچێت»، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی موبارەکی کێشای بەڕانی یان شانی ئەوەی قسەکەی بۆ کرد کە موعاز بوو، پێی فەرموو: «ئەمەی بۆت دەگێڕمەوە ڕاستییە و ڕوو دەدات تۆ چۆن ئێستا لێرە دانیشتوویتە هیچ گومانی تێدا نییە»، یان «تۆ لێرەیت، ئەوەیش ئاوا ڕوو دەدات».



## بَابٌ فِي تَدَاعِي الْأُمَمِ عَلَى الْإِسْلَامِ

### باسێك دەربارەی کۆبوونەوەی ئوممەتان (ی کافر) لەسەر ئیسلام

٧٢٨. عَنْ ثَوْبَانَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُوشِكُ الْأُمَمُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ كَمَا تَدَاعَى الْأَكَلَةُ إِلَى قَصْعَتِهَا»، فَقَالَ قَائِلٌ: وَمِنْ قِلَّةٍ نَحْنُ يَوْمَئِذٍ؟ قَالَ: «بَلْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ، وَلَكِنَّكُمْ غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ، وَلَيَنْزَعَنَّ اللَّهُ مِنْ صُدُورِ عَدُوِّكُمُ الْمَهَابَةَ مِنْكُمْ، وَلَيَقْذِفَنَّ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمُ الْوَهْنَ»، فَقَالَ قَائِلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا الْوَهْنُ؟ قَالَ: «حُبُّ الدُّنْيَا، وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ».

سەوبان ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نزیکە ئوممەتان لەسەرتان کۆ ببنەوە بۆ لەناوبردنتان، هەر وەکوو چۆن کەسانێك لەسەر تاسێکی خواردن کۆ

دەبنەوە»، کەسێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئێمە لەو ڕۆژەدا ژمارەمان کەمە؟ فەرمووی: «نەخێر، ئێوە لەم ڕۆژەدا زۆرن، بەڵام وەکوو کەفی سەر دەریان، خوا لاوازی و کەمیی ئێوە لە دڵی دوژمنەکان دەردەکات، خوای گەورە ترس دەخاتە دڵی ئێوە»، یەکێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ترس و لاوازی چییە کە دەیخاتە دڵمانەوە و لاوازمان دەکات؟ فەرمووی: «دونیاتان خۆش دەوێت و ڕقتان لە مردن دەبێت».

## بَابٌ فِي الْمَعْقِلِ مِنَ الْمَلَاحِمِ

### باسێك دەربارەی پەناگە (ی موسوڵمانان) لە کاتی شەڕە گەورەکە



**٧٢٩. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ فُسْطَاطَ الْمُسْلِمِينَ يَوْمَ الْمَلْحَمَةِ بِالْغُوطَةِ، إِلَى جَانِبِ مَدِينَةٍ يُقَالُ لَهَا: دِمَشْقُ، مِنْ خَيْرِ مَدَائِنِ الشَّامِ».**

ئەبو دەرداء ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «قەڵای قایم و بەهێزی کۆمەڵی موسوڵمانان لە ڕۆژی شەڕە گەورەکەدا لە (غوطة) دەبێت، لە نزیك شارێکە پێی دەگوترێت: دیمەشق، کە یەکێکە لە باشترین شارەکانی وڵاتی شام».

## بَابُ ارْتِفَاعِ الْفِتْنَةِ فِي الْمَلَاحِمِ

### باسی زۆربوونی ئاشووب و ئاژاوە لە کاتی شەڕە گەورەکەدا

**٧٣٠. عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَنْ يَجْمَعَ اللَّهُ عَلَى هَذِهِ الْأُمَّةِ سَيْفَيْنِ، سَيْفًا مِنْهَا، وَسَيْفًا مِنْ عَدُوِّهَا».**

عەوفی کوڕی مالیك ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا دوو

شمشێر کۆ ناکاتەوە لەسەر ئەم ئوممەتە (ئەمە تایبەتمەندیەتی ئەم ئوممەتەیە) کە شمشێرێك لە خۆیان بێت و شمشێرێك لە دوژمنەکەیان».

## بَابُ أَمَارَاتِ السَّاعَةِ

### باسی نیشانەکانی دونیا تێکچوون

٧٣١. عَنْ أَبِي زُرْعَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ نَفَرٌ إِلَى مَرْوَانَ بِالْمَدِينَةِ، فَسَمِعُوهُ يُحَدِّثُ فِي الْآيَاتِ: أَنَّ أَوَّلَهَا الدَّجَّالُ، قَالَ: فَانْصَرَفْتُ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو، فَحَدَّثْتُهُ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: لَمْ يَقُلْ شَيْئًا، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَوَّلَ الْآيَاتِ خُرُوجًا طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، أَوِ الدَّابَّةُ عَلَى النَّاسِ ضُحًى، فَأَيَّتُهُمَا كَانَتْ قَبْلَ صَاحِبَتِهَا، فَالْأُخْرَى عَلَى أَثَرِهَا». قَالَ عَبْدُ اللَّهِ، وَكَانَ يَقْرَأُ الْكُتُبَ: وَأَظُنُّ أَوَّلَهُمَا خُرُوجًا طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا.

ئەبو زورعە ﷺ دەڵێت: کەسانێك هاتن بۆلای مەڕوانی کوڕی حەکەم (والی بوو) لە مەدینە، باسی نیشانەکانی کۆتاییهاتنی دونیای کرد، گوتی: یەکەم نیشانە دەججالە، دەڵێت: منیش چووم بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی عەمر ﷺ بۆم باس کرد، عەبدوڵلا گوتی: مەڕوان هیچی نەگوتووە، (قسەکانی وا نییە، چونکە ئەو صەحابە نەبووە تا فەرموودە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ بگێڕێتەوە، جا گوتی:) گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: «یەکەم نیشانە لە نیشانە گەورەکانی قیامەت دەرکەوتن و هەڵاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە، یاخود ئاژەڵێکە بە ڕۆژی نیوەڕۆ بە چێشتەنگاو دەردەچێت قسە لەگەڵ خەڵك دەکات، هەر کامێکیان بێت لەمە ئەوەی دیکە یەکسەر بەدوایدا دێت»، لەو کاتەدا عەبدوڵلا کتێبی دەخوێندەوە، گوتی: من پێم وایە یەکەمیان دەرکەوتن و هەڵاتنی خۆرە لە خۆرئاواوە.

٧٣٢. عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ الْغِفَارِيِّ ﵁ قَالَ: كُنَّا قُعُودًا نَتَحَدَّثُ فِي ظِلِّ غُرْفَةٍ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَذَكَرْنَا السَّاعَةَ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُنَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَنْ تَكُونَ -أَوْ لَنْ تَقُومَ- السَّاعَةُ حَتَّى يَكُونَ قَبْلَهَا عَشْرُ آيَاتٍ: طُلُوعُ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَخُرُوجُ الدَّابَّةِ، وَخُرُوجُ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَالدَّجَّالُ، وَعِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ، وَالدُّخَانُ، وَثَلَاثَةُ خُسُوفٍ، خَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَآخِرُ ذَلِكَ تَخْرُجُ نَارٌ مِنَ الْيَمَنِ، مِنْ قَعْرِ عَدَنٍ، تَسُوقُ النَّاسَ إِلَى الْمَحْشَرِ».

حوزەیفەی کوڕی ئوسەیدی غیفاری ﵁ دەڵێت: لەژێر سێبەری ژوورێك لە ژوورەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین قسەمان دەکرد، باسی قیامەتمان کرد، دەنگمان بەرز بووەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «دونیا تێك ناچێت هەتا دە نیشانە لەپێشیدا نەیەن: هەڵاتنی خۆر لە خۆرئاواوە، دەرچوونی ئاژەڵێك لە زەوییەوە، هاتنی یەئجووج و مەئجووج، هاتنی دەججال، دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم، دووکەڵەکە و سێ ڕۆچوون بە زەویدا، ڕۆچوونێك لە ڕۆژئاوا، ڕۆچوونێك لە ڕۆژهەڵات، ڕۆچوونێك لە دوورگەی عەرەب، دوا نیشانەش ئاگرێکە لەوپەڕی عەدەنەوە دێت کە شارێکە لە یەمەن، خەڵك ڕاودەنێت و بەڕێیان دەکات بەرەو ساحەی مەحشەر (کە دەگوترێت: زەوی شامە)».

٧٣٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا، فَإِذَا طَلَعَتْ وَرَآهَا النَّاسُ آمَنَ مَنْ عَلَيْهَا، فَذَاكَ حِينَ: {لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا} الأنعام: ١٥٨، الْآيَةَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دونیا تێك ناچێت هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەیەت، جا کاتێك خۆرهەڵات لە خۆرئاواوە خەڵك ببینێت هەمووی

بڕوا دێنن، ئەمیش مانای ئەم ئایەتەیە کە خوا دەفەرموێت: {لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِي إِيمَانِهَا خَيْرًا}، واتە: ئەوکاتە بڕواهێنان سوود بە کەس ناگەیەنێت کە پێشتر بڕوای نەهێنابێت، یان ئەگەر بڕواداریش بێت، بەڵام خراپەکار بێت و تەوبەی نەکردبێت تەوبەکردن سوودی پێ ناگەیەنێت».

## بَابٌ فِي حَسْرِ الْفُرَاتِ عَنْ كَنْزٍ

### باسێك دەربارەی وشکبوونی فوڕات و دەردەکەوتنی گەنجینەی زێڕ

٧٣٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «يُوشِكُ الْفُرَاتُ أَنْ يَحْسِرَ عَنْ كَنْزٍ مِنْ ذَهَبٍ، فَمَنْ حَضَرَهُ فَلَا يَأْخُذْ مِنْهُ شَيْئًا».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نزیکە فوڕات گەنجینەیەك لە ئاڵتوونی لێ دەرکەوێت، هەر کەسێك ئامادە بوو، با هیچی لێ نەبات».

## بَابُ خُرُوجِ الدَّجَّالِ

### باسی دەرچوونی دەجال

٧٣٥. قَالَ حُذَيْفَةُ ﵁: لَأَنَا بِمَا مَعَ الدَّجَّالِ أَعْلَمُ مِنْهُ، إِنَّ مَعَهُ بَحْرًا مِنْ مَاءٍ، وَنَهَرًا مِنْ نَارٍ، فَالَّذِي تَرَوْنَ أَنَّهُ نَارٌ مَاءٌ، وَالَّذِي تَرَوْنَ أَنَّهُ مَاءٌ نَارٌ، فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ، فَأَرَادَ الْمَاءَ فَلْيَشْرَبْ مِنَ الَّذِي يَرَى أَنَّهُ نَارٌ، فَإِنَّهُ سَيَجِدُهُ مَاءً.

حوزەیفە ﵁ دەڵێت: ئەوەی کە دەجال پێیەتی من لە خۆی شارەزاترم پێی، دەریایەك لە ئاو و ڕووبارێك لە ئاگری پێیە، ئەوەی کە نیشانی ئێوەی دەدا ئاگرە، ئەوە ئاوە، ئەوەیشی واتان نیشان دەدات ئاوە، ئەوە ئاگرە، هەر کەسێك لە ئێوە

گەیشت بە دەججال ویستی لە ئاوەکە بخواتەوە، با لە ئاگرەکە بخواتەوە، ئەوەی کە دەیبینی ئاگرە دەبینی ئەوە ئاوە.

٧٣٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا بُعِثَ نَبِيٌّ إِلَّا قَدْ أَنْذَرَ أُمَّتَهُ الدَّجَّالَ، الْأَعْوَرَ الْكَذَّابَ، أَلَا وَإِنَّهُ أَعْوَرُ، وَإِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ، وَإِنَّ بَيْنَ عَيْنَيْهِ مَكْتُوبًا كَافِرٌ».

ئەنەسی کوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە مەگەر ئوممەتەکەی ئاگادار کردۆتەوە لە دەججالی کوێری درۆزن، ئاگادار بن ئەو چاوێکی کوێرە، پەروەردگاری ئێوە کوێر نییە، لە نێوەڕاستی هەردوو چاوی لە نێوچاوانی نووسراوە کافر».

٧٣٧. عَنْ عِمْرَانَ بْنَ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَمِعَ بِالدَّجَّالِ فَلْيَنْأَ عَنْهُ، فَوَاللَّهِ إِنَّ الرَّجُلَ لَيَأْتِيهِ وَهُوَ يَحْسِبُ أَنَّهُ مُؤْمِنٌ فَيَتَّبِعُهُ، مِمَّا يَبْعَثُ بِهِ مِنَ الشُّبُهَاتِ».

عیمڕانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك گوێبیستی هاتنی دەججال بوو، با خۆی لێ دوور بخاتەوە (بەرەو لای نەچێت)، سوێند بە خوا گەورە پیاوی وا هەیە دەچێت بۆ لای دەجال، وا گومان دەبات کە بڕواداره، بەڵام ئەوەندە گومان و شوبهەکانی بەهێزن بڕوای پێ دەکات و شوێنی دەکەوێت».

✎ تێبینی:

دەججال توانایەکی زۆری پێ دراوە لەلایەن خواوە، ئەوەش بۆ تاقیکردنەوەی ئیمانی ئیماندارانە، سیحر دەکات، مردوو زیندوو دەکاتەوە، باران دەبارێنێت، ڕووەك و دانەوێڵە سەوز دەکات، ئەوەی کە بتەوێت دەیکات.

٧٣٨. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آيَاتٍ مِنْ أَوَّلِ سُورَةِ الْكَهْفِ، عُصِمَ مِنْ فِتْنَةِ الدَّجَّالِ».

ئەبو دەرداء ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێك دە ئایەت لە سەرەتای سووڕەتی کەهف لەبەر بکات، ئەوە دەپارێزرێت لە ئاشووبی دەججال».

## بَابُ قِيَامُ السَّاعَةِ

### باسی دونیا تێکچوون

٧٣٩. عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ لَا تَعْجِزَ أُمَّتِي عِنْدَ رَبِّهَا أَنْ يُؤَخِّرَهُمْ نِصْفَ يَوْمٍ»، قِيلَ لِسَعْدٍ: وَكَمْ نِصْفُ ذَلِكَ الْيَوْمِ؟ قَالَ: «خَمْسُ مِائَةِ سَنَةٍ».

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «دەوڵەمەندەکانی ئوممەتم ئومێد دەکەم خوا بێدەسەڵاتیان نەکات، توانای ئەوەیان بداتێ ئارام بگرن ئەو نیو ڕۆژە ڕابوەستن»، (کە نیو ڕۆژ هەژاران پێش دەوڵەمەندان دەچنە بەهەشتەوە)، بە سەعد گوترا: نیو ڕۆژ چەندێکە؟ فەرمووی: «پێنج سەد ساڵە».

# كِتَابُ الْحُدُودِ

## پەرتووكی سزای تاوانەكان

### بَابُ فِي الْحَدِّ يُشْفَعُ فِيهِ

### باسێك دەربارەی تكاكردن لە دەركردنی سزای شەرعی

٧٤٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ، فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا؟ - يَعْنِي - رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، قَالُوا: وَمَنْ يَجْتَرِئُ إِلَّا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أُسَامَةُ، أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ؟». ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ، فَقَالَ: «إِنَّمَا هَلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ، وَايْمُ اللَّهِ، لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ، لَقَطَعْتُ يَدَهَا».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: كاری ئەو ئافرەتە مەخزوومییەی كە دزی كرد، قوڕەیشی خەفەتبار كرد، بۆئەوەی ئابڕوویان نەچێت لەنێو هۆزەكانی دیكەدا (بەنو مەخزووم هۆزێكی گەورەیە لە قوڕەیش)، گوتیان: كێ دەچێت لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ قسە بكات؟ گوتیان: كێ دەوێرێت بڕوات بۆ ئەم بابەتە، جگە لە ئوسامەی كوڕی زەید

خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ ئوسامە قسەی لەگەڵ کرد (و داوای کرد دەستی نەبڕێتەوە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەی ئوسامە تۆ هاتوویت تکا دەکەیت بۆ ئەوەی سنوورێك لە سنوورەکانی خوا جێبەجێ نەکرێت»، دوای ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا وتاری دا، فەرمووی: «ئوممەتانی دیکە خوا بۆیە لەناوی بردوون یەکێك لە هۆکارەکان ئەوە بووە، کاتێك کەسێکی ناودار دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا، وە کاتێك کەسێکی لاواز دزی بکردایە حەددیان بەسەردا جێبەجێ دەکرد، سوێند بە خوای گەورە ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد ﷺ دزی بکات، ئەوە دەستی دەبڕم».

٧٤١. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَقِيلُوا ذَوِي الْهَيْئَاتِ عَثَرَاتِهِمْ إِلَّا الْحُدُودَ».

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «گەورە و خاوەن پێگەکان ئەگەر تووشی هەڵە و ترازانێك بوون، چاوپۆشییان لێ بکەن، جگە لە سزا شەرعییەکان».



٧٤٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «تَعَافُّوا الْحُدُودَ فِيمَا بَيْنَكُمْ، فَمَا بَلَغَنِي مِنْ حَدٍّ فَقَدْ وَجَبَ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە نێوان خۆتاندا ئەگەر کەسێك تاوانی کرد و سزای لەسەر بوو، لە یەکدی خۆش بن، بەڵام ئەگەر بگات بە من، من جێبەجێی دەکەم».

## بَابٌ فِي الرَّجُلِ يَعْتَرِفُ بِحَدٍّ وَلَا يُسَمِّيهِ

### باسێك دەربارەی ئەو کەسەی دەڵێت سزام لەسەرە و ناوی سزاکەش ناهێنێت

٧٤٣. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: إِنِّي أَصَبْتُ

حَدًّا، فَأَقِمْهُ عَلَيَّ، قَالَ «تَوَضَّأْتَ حِينَ أَقْبَلْتَ؟»، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «هَلْ صَلَّيْتَ مَعَنَا حِينَ صَلَّيْنَا؟»، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «اذْهَبْ فَإِنَّ اللَّهَ تَعَالَى قَدْ عَفَا عَنْكَ».

ئەبو ئومامە ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من تاوانێکم کردووە تووشی سزای شەرعی بووم، لەسەرم جێبەجێ بکە، فەرمووی: «دەستنوێژت شوشت کە هاتی بۆ ئێرە؟»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «ئەی کاتێك ئێمە نوێژی بەکۆمەڵمان کرد لەگەڵمان نوێژت کرد؟»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «دە بڕۆ خوا لێت خۆش بووە».

## بَابُ مَا يُقْطَعُ فِيهِ السَّارِقُ

### باسی ئەو شتەی دەستی دزی لەسەر دەبڕدرێت

٧٤٤. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ فِي رُبُعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا».

عائیشە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «دەستی دز دەبڕێتەوە لە ڕوبعە دینارێك بەرەو سەرەوە».

٧٤٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَطَعَ فِي مِجَنٍّ ثَمَنُهُ ثَلَاثَةُ دَرَاهِمَ.

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کەسێکی بڕیەوە کە قەڵغانێکی دزیبوو، نرخەکەی سێ دەرهەم بووە (واتە: ڕوبعە دینارێك بوو).

## بَابُ الْقَطْعِ فِي الْخُلْسَةِ وَالْخِيَانَةِ

### باسی دەستبڕین لەسەر شت ڕفاندن و خیانەت

٧٤٦. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ عَلَى الْمُنْتَهِبِ

قَطْعٌ، وَمَنْ انْتَهَبَ نُهْبَةً مَشْهُورَةً فَلَيْسَ مِنَّا».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کەسێك کە شتێك دەبات وەکوو تاڵانی و بە بەرچاوی خەڵکەوە دەیبات، ئەوە دەستبڕینی لەسەر نییە، ئەگەر کەسێك شتێکی ئاوا بیات کە نەشاردرابێتەوە، ئەوە لە ئێمە نییە».

## بَابٌ فِي الْمَجْنُونِ يَسْرِقُ أَوْ يُصِيبُ حَدًّا

### باسێك دەربارەی شێت دزی بکات یان سنوورەکان بشکێنێت

٧٤٧. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «رُفِعَ الْقَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الْمُبْتَلَى حَتَّى يَبْرَأَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَكْبُرَ».

دایکمان عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «قەڵەم لەسەر سێ کەس هەڵگیراوە: نوستوو هەتا بەئاگا دێتەوە، شێت تاکوو چاك دەبێتەوە، منداڵیش هەتا گەورە دەبێت».

## بَابٌ فِي الرَّجُلِ يَسْرِقُ فِي الْغَزْوِ أَيُقْطَعُ؟

### باسێك دەربارەی ئەو کەسەی لە غەزا دزی دەکات، ئایا دەستی دەبڕدرێتەوە؟

٧٤٨. عَنْ جُنَادَةَ بْنِ أَبِي أُمَيَّةَ قَالَ: كُنَّا مَعَ بُسْرِ بْنِ أَرْطَاةَ فِي الْبَحْرِ، فَأُتِيَ بِسَارِقٍ يُقَالُ لَهُ: مِصْدَرٌ، قَدْ سَرَقَ بُخْتِيَّةً، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا تُقْطَعُ الْأَيْدِي فِي السَّفَرِ، وَلَوْلَا ذَلِكَ لَقَطَعْتُهُ».

جونادەی کوڕی ئەبو ئومەییە دەڵێت: لەگەڵ بوسری کوڕی ئەرتاتدا لە غەزایەك

بووین له دەریا، دزێکیان هێنا ناوی میصدەر بوو، وشترێکی (بوختی) دزیبوو، (وشتری خوڕاسانی مێی ملدرێژە)، بوسر گوتی: گوێم له پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «دەستی دز له سەفەردا نابڕدرێت، ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە دەستیم دەبڕی».

## بَابُ فِي الرَّجْمِ

### باسێك دەربارەی بەردبارانكردن

٧٤٩. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خُذُوا عَنِّي، خُذُوا عَنِّي، قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً: الثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ وَرَمْيٌ بِالْحِجَارَةِ، وَالْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ».

عوبادەی كوڕی صامیت رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لێم وەربگرن، لێم وەربگرن خوا ڕێی بۆ دۆزینەوە، (بۆ ئەو ئافرەتانەی خوا لەبارەیانەوە فەرموویەتی: {حَتَّى يَتَوَفَّاهُنَّ الْمَوْتُ أَوْ يَجْعَلَ اللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلاً} النساء: ١٥)، پیاوی هاوسەردار و ئافرەتی هاوسەردار و كوڕی گەنج و كچی گەنج (هیی زیناكار) پێكەوە سزا دەدرێن، پیاو و ئافرەتی هاوسەردار یەكی سەد قامچییان لێ دەدرێت، دواییش بەردباران دەكرێن (تاكوو دەمرن)، كوڕ و كچی (بێهاوسەر)یش یەكی سەد قامچییان لێ دەدرێت و ساڵێكیش دوور دەخرێنەوە.

٧٥٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: جَاءَ مَاعِزُ بْنُ مَالِكٍ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَاعْتَرَفَ بِالزِّنَا مَرَّتَيْنِ، فَطَرَدَهُ، ثُمَّ جَاءَ فَاعْتَرَفَ بِالزِّنَا مَرَّتَيْنِ، فَقَالَ: «شَهِدْتَ عَلَى نَفْسِكَ أَرْبَعَ مَرَّاتٍ، اذْهَبُوا بِهِ فَارْجُمُوهُ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: ماعیزی كوڕی مالیك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ دوو

جار دانی پێدا هێنا کە زینام کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەریکرد، دوایی هاتەوە دوو جاری دیکە دانی پێدا نا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەوە چوار جار شایەتی لەسەر خۆت بدەیت، بیبەن سزای شەرعیی لەسەر جێبەجێ بکەن».

٧٥١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِمَاعِزِ بْنِ مَالِكٍ: «لَعَلَّكَ قَبَّلْتَ، أَوْ غَمَزْتَ، أَوْ نَظَرْتَ؟»، قَالَ: لَا، قَالَ: «أَفَنِكْتَهَا؟»، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: فَعِنْدَ ذَلِكَ أَمَرَ بِرَجْمِهِ.

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بە ماعیزی کوڕی مالیك دەفەرموێت: «لەوانەیە ماچت کردبێت، لەوانەیە دەستت لێ دابێت، لەوانەیە تەماشات کردبێت» (هەر بۆئەوەی بڕوات، بگەڕێرەوە زینات نەکردووە با حەددی خوات لەسەر جێبەجی نەکەین، پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی نەدەکرد حەد لە کەس دەربکات)، هەر دەیگوت: نەخێر، (ئەمیش دەیزانی تاوانی کردووە و دەیویست لە دونیا پاك بێتەوە پێش قیامەت)، فەرمووی: «ئەی لەگەڵی جووت بوویت؟»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دوای ئەوە فەرمانی کرد کە سزای شەرعیی لەسەر جێبەجێ بکرێت.

## بَابُ فِيمَنْ عَمِلَ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ

### باسێك دەربارەی ئەو کەسەی کردەوەی قەومی لووطی کردووە (نێربازی)

٧٥٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ، فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ، وَالْمَفْعُولَ بِهِ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێکتان بینی کردەوەی قەومی لووط دەکات، بکەر و لەگەڵکراو هەردووکیان بکوژن».

تێبینی:

جێبەجێکردنی ئەم سزا شەرعییانە کاری دەسەڵات و دەوڵەتە، نەك تاك، بۆیە بە هیچ جۆرێك نابێت تاك تاکی کۆمەڵگا هەڵسن بە جێبەجێکردنی سزا شەرعییەکان، ئەگەرنا فەوزا و ئاژاوە لەنێو کۆمەڵگا دروست دەبێت.

## بَابٌ إِذَا أَقَرَّ الرَّجُلُ بِالزِّنَا، وَلَمْ تُقِرَّ الْمَرْأَةُ

### باسێك دەربارەی ئەوەی کاتێك پیاو دان دەنێت بە زینا و ژنەکەش دانی پێدا نانێت

٧٥٣. عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً أَتَاهُ فَأَقَرَّ عِنْدَهُ أَنَّهُ زَنَى بِامْرَأَةٍ سَمَّاهَا لَهُ، فَبَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَى الْمَرْأَةِ، فَسَأَلَهَا عَنْ ذَلِكَ، فَأَنْكَرَتْ أَنْ تَكُونَ زَنَتْ، فَجَلَدَهُ الْحَدَّ وَتَرَكَهَا.

سەهلی کوڕی سەعد ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ دانی نا بەوەی کە زینای کردووە لەگەڵ ئافرەتێکدا و ناوی ئافرەتەکەشی هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێکی نارد بۆلای ئافرەتەکە پرسیاری کرد (ئایا تۆ لەگەڵ ئەم پیاوە زینات کردووە)؟ نکوولّی کرد کە زینای کردبێت، جەڵدی لە پیاوەکە دا، بەڵام وازی لە ئافرەتەکە هێنا (لەبەر ئەوەی مادام شایەت نییە و خۆیشی دانی پێدا نانێت، ناچار وازی لێ دەهێنرێت، نێوان خۆی و خوای گەورە).

## بَابٌ فِي الرَّجُلِ يُصِيبُ مِنَ الْمَرْأَةِ دُونَ الْجِمَاعِ، فَيَتُوبُ قَبْلَ أَنْ يَأْخُذَهُ الْإِمَامُ

### باسێك دەربارەی ئەو پیاوەی ژنێك ماچ بكات و جووت نەبێت و تەوبە بكات پێش ئیمام بیگرێت

٧٥٤. قَالَ عَبْدُ اللَّهِ ﷺ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: إِنِّي عَالَجْتُ امْرَأَةً مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ، فَأَصَبْتُ مِنْهَا مَا دُونَ أَنْ أَمَسَّهَا، فَأَنَا هَذَا، فَأَقِمْ عَلَيَّ مَا شِئْتَ، فَقَالَ عُمَرُ: قَدْ سَتَرَ اللَّهُ عَلَيْكَ لَوْ سَتَرْتَ عَلَى نَفْسِكَ، فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ شَيْئًا، فَانْطَلَقَ الرَّجُلُ، فَأَتْبَعَهُ النَّبِيُّ ﷺ رَجُلًا، فَدَعَاهُ، فَتَلَا عَلَيْهِ، **{وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ}** هود:١١٤، إِلَى آخِرِ الْآيَةِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَهُ خَاصَّةً أَمْ لِلنَّاسِ كَافَّةً؟ فَقَالَ: «لِلنَّاسِ كَافَّةً».

عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتی: من لە ئافرەتێك نزیك بوومەتەوە هەموو شتێكم لەگەڵی كردووە جگە لە زینا، لە شوێنێكی دوور لە مەدینە، ئێستا من لەبەر دەستتدام چۆن ویستت لێیە سنووری خوای گەورەم بەسەردا جێبەجێ بكە (من ئامادەم و پابەندم)، عومەر ﷺ گوتی: خوای گەورە بۆتی داپۆشیوە بۆ خۆت لەسەر خۆتی داناپۆشیت (بڕۆ لە نێوان خۆت و خوا تەوبە بكە)، پێغەمبەر ﷺ وەڵامی نەدایەوە، پیاوەكە دوایی ڕۆیشت، پێغەمبەر ﷺ پیاوێكی بەدوادا نارد بانگی كرد ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە: **{وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ}**، واتە: نوێژ بكە لە هەردوو لای ڕۆژەوە[1]، تا كۆتایی ئایەتەكە، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەمە تایبەت بۆ ئەوە، یان بۆ هەموو

..............................

(١) هەردوولا دەگوترێت: لای یەكەمی بەیانییە نوێژی ڕۆژ، لای دووەمیشی نیوەڕۆ و عەسرە، زولەفیش لە شەودا مەغریب و عیشایە، واتە هەر پێنج نوێژە فەڕزەكان بكە لەبەر ئەوەی چاكە خراپەكە دەسڕێتەوە، واتە تۆ ئەگەر ئەو شتەشت كردووە كە نوێژت كردووە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێتە هۆی سڕینەوەی ئەو تاوانانەت، واتە حەددی لەسەر نییە.

خەڵکە؟ فەرمووی: « (ئەم حوکمە) بۆ تێکڕای خەڵکە».

## بَابُ الْحَدِّ فِي الْخَمْرِ

### باسی دەرکردنی سزای شەرعی لەسەر مەیخۆر

٧٥٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ، فَقَالَ: «اضْرِبُوهُ»، قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: فَمِنَّا الضَّارِبُ بِيَدِهِ، وَالضَّارِبُ بِنَعْلِهِ، وَالضَّارِبُ بِثَوْبِهِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، قَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: أَخْزَاكَ اللَّهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُولُوا هَكَذَا، لَا تُعِينُوا عَلَيْهِ الشَّيْطَانَ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێکیان هێنا بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ عارەقی خواردبووەوە، فەرمووی: «لێی بدەن»، ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: هەبوو بە دەست لێی دەدا، هەبوو بە نەعلەکەی لێی دەدا، هەبوو بە پۆشاکەکەی لێی دەدا، کاتێك کە لە لێدانەکەی بوونەوە، هەندێك لەو کەسانەی لەوێ بوون گوتیان: ئەی خوا ڕیسوات بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «وا مەڵێن، یارمەتیدەری شەیتان مەبن بەسەریدا (لەبەر ئەوەی شەیتان تاوانی بۆ دەڕازێنێتەوە بۆ ئەوەی سەرشۆڕی بکات، ئێوەش ئەگەر دوعای سەرشۆڕیی لێ بکەن، وەك ئەوە وایە یارمەتی شەیتانتان دابێت بەسەر براکەتاندا)».

## بَابُ إِذَا تَتَابَعَ فِي شُرْبِ الْخَمْرِ

### باسێك دەربارەی کەسی ئالوودەبوو بە مەیخواردنەوە

٧٥٦. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: لَا أَدِي - أَوْ مَا كُنْتُ لِأَدِيَ - مَنْ أَقَمْتُ عَلَيْهِ حَدًّا، إِلَّا

شَارِبَ الْخَمْرِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يَسُنَّ فِيهِ شَيْئًا، إِنَّمَا هُوَ شَيْءٌ قُلْنَاهُ نَحْنُ.

عەلی ﵁ دەڵێت: دییە و خوێنی هیچ کەسێك نادەم کە حەددی بەسەردا جێبەجێ بکەم، مەگەر کەسێك جەڵدی لێ بدەم لەبەر مەیخواردنەوە و بمرێت، ئەوە خوێنەکەی دەدەم، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ شتێکی لەمەیان بە سوننەت دانەناوە (یانی زیاد لە چل، مەبەستی ئەوەیە ئەگەرنا فەرموودەکان هەیە پێغەمبەری خوا ﷺ جەڵدەی داوە و فەرمانیشی کردووە)، (بەڵکوو هەشتاکە) شتێکە کە ئێمە گوتوومانە (پێشەوا عومەر هەشتاکەی کردووە لەبەر ئەو حیکمەتە).

## بَابٌ فِي التَّعْزِيرِ

### باسێك دەربارەی تەمبێکردن

٧٥٧. عَنْ أَبِي بُرْدَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: «لَا يُجْلَدُ فَوْقَ عَشْرِ جَلَدَاتٍ إِلَّا فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ ﷻ».

ئەبو بوڕدە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «ئەگەر کەسێك سنوورێك لە سنوورەکانی خوای بەزاندبێت، ئەگەرنا کەس لە دە جەڵد زیاتری لێ نادرێت (وەکوو تەمبێکردن)».

# كِتَابُ الدِّيَاتِ

## پەرتووکی خوێنبایی

### بَابُ الْإِمَامِ يَأْمُرُ بِالْعَفْوِ فِي الدَّمِ

باسی ئەوە کە دەسەڵاتدار داوا دەکات بە لێبووردنی (تاوانبار) کە کەسێکی کوشتووە

٧٥٨. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ رُفِعَ إِلَيْهِ شَيْءٌ فِيهِ قِصَاصٌ، إِلَّا أَمَرَ فِيهِ بِالْعَفْوِ.

ئەنەسی کوڕی مالیك ﵁ دەڵێت: نەمبینیوە پێغەمبەر ﷺ لە تۆڵەسەندنەوەدا هیچ شتێکی بۆلا بەرز بکرێتەوە، مەگەر فەرمانی کردووە بە لێخۆشبوونی.

### بَابُ يُقَادُ مِنَ الْقَاتِلِ

باسی تۆڵەکردنەوە لە بکوژ

٧٥٩. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ جَارِيَةً وُجِدَتْ قَدْ رُضَّ رَأْسُهَا بَيْنَ حَجَرَيْنِ، فَقِيلَ لَهَا:

مَنْ فَعَلَ بِكِ هَذَا؟ أَفُلَانٌ؟ أَفُلَانٌ؟ حَتَّى سُمِّيَ الْيَهُودِيُّ، فَأَوْمَتْ بِرَأْسِهَا، فَأُخِذَ الْيَهُودِيُّ، فَاعْتَرَفَ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ يُرَضَّ رَأْسُهُ بِالْحِجَارَةِ.

ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: کیژۆڵەیەکی بچووك بینرایەوە سەری لە نێوان دوو بەرددا شکێندرابوو، پێی گوترا: کێ وای لێ کردیت؟ ئایا فڵانە کەس بوو، ئایا فڵانە کەس بوو؟ تا ناوی جوولەکەیەکیان هێنا فڵانی جوولەکە وای لێ کردوویت؟ بە سەری ئاماژەی کرد جوولەکەکەیان هێنا، (پاش ئەوەی) دانی پێدا نا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد سەری بخەنە نێوان دوو بەردەوە.

## بَابُ دِيَاتِ الْأَعْضَاءِ

### باسی خوێنبایی ئەندامەکانی لەش (چەندە؟)

٧٦٠. عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْأَصَابِعُ سَوَاءٌ عَشْرٌ عَشْرٌ مِنَ الْإِبِلِ».

ئەبو مووسا ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «پەنجەکان یەکسانن (پەنجەی دەست بێت، یان پێ بێت، تەنانەت ئەگەر پەنجە بچووکەکانیش بێت)، هەر یەکێك لەوانە ئەگەر ببڕدرێتەوە خوێنباییەکەی دە وشترە».

٧٦١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الْأَصَابِعُ سَوَاءٌ، وَالْأَسْنَانُ سَوَاءٌ، الثَّنِيَّةُ وَالضِّرْسُ سَوَاءٌ، هَذِهِ وَهَذِهِ سَوَاءٌ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پەنجەکان هەموویان یەکسانن، ددانەکانیش دووانەکان یان خرێنەکان یەکسانن، ئەوە و ئەوەش یەکسانن (پەنجەی گەورە و پەنجەی گچکە)».

٧٦٢. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ: أَنَّ امْرَأَتَيْنِ مِنْ هُذَيْلٍ قَتَلَتْ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى

وَلِكُلِّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا زَوْجٌ وَوَلَدٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ دِيَةَ الْمَقْتُولَةِ عَلَى عَاقِلَةِ الْقَاتِلَةِ، وَبَرَّأَ زَوْجَهَا وَوَلَدَهَا، قَالَ: فَقَالَ عَاقِلَةُ الْمَقْتُولَةِ: مِيرَاثُهَا لَنَا؟ قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا، مِيرَاثُهَا لِزَوْجِهَا وَوَلَدِهَا».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە: دوو ئافرەت لە هوزەیل یەکێکیان ئەوەی دیکەی کوشت، هەر یەکێك لەوانە مێردی هەبوو منداڵیشی هەبووە، پێغەمبەری خوا ﷺ خوێنبایی کوژراوەکەی خستە سەر کەسوکاری بکوژەکە، مێردەکەی و منداڵەکەی تەبرئە کرد لەوەی کە خوێنبایی بدەن (خوێنبایی ناکەوێتە سەر مێرد و منداڵەکەی، دەکەوێتە سەر کەسوکاری ئافرەتەکە)، کەسوکاری کوژراوەکەش گوتیان: میراتی ئەمە بۆ ئێمەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «نەخێر، میراتەکەی بۆ کوڕ و مێردەکەیەتی».

## بَابُ فِيمَنْ تَطَبَّبَ بِغَيْرِ عِلْمٍ فَأَعْنَتَ

### باسێك دەربارەی کەسێك بەبێ زانیاری خۆی بکات بە پزیشك و زیان لە نەخۆشەکە بدات

٧٦٣. عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَطَبَّبَ، وَلَا يُعْلَمُ مِنْهُ طِبٌّ، فَهُوَ ضَامِنٌ».

عەمری کوڕی شوعەیب، لە باوکیەوە، لە باپیرییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك خۆی بکات بە پزیشك و چارەسەری خەڵکی بکات و نەزانرێت کە ئەمە پزیشکە و شارەزایی هەیە (هەر زەرەرێکی لە نەخۆشێك دا)، ئەوە زەمانە (و دەبێت بۆی ببژێرێت و خوێنباییەکەی لێ دەسەنرێت)».

# كِتَابُ السُّنَّةِ

## پەرتووکی سوننەت

### بَابُ شَرْحِ السُّنَّةِ

باسی ڕاڤەکردنی سوننەت

٧٦٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «افْتَرَقَتِ الْيَهُودُ عَلَى إِحْدَى أَوْ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَتَفَرَّقَتِ النَّصَارَى عَلَى إِحْدَى أَوْ ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جوولەکە بوونە حەفتا و یەك، یان حەفتا و دوو کۆمەڵەوە، گاورەکانیش بوونە حەفتا و یەك، یان حەفتا و دوو کۆمەڵەوە، ئوممەتی منیش دەبێتە حەفتا و سێ کۆمەڵ».

تێبینی:

ئەم فەرموودەیە هەموو کەس مافی ئەوەی نییە بە ئارەزووی خۆی و بۆ سەرخستنی بیروباوەڕ و گرووپی خۆی بەکاری بێنێت و پێی وا بێت گرووپەکانی دیکەی

موسوڵمانان لەو حەفتا و سێ کۆمەڵەیەن، چونکە گومانی تێدا نییە موسوڵمان بە هەر ناوێك بن مادام ئەهلی قیبلە بن و لە چوارچێوەی ئیسلامدا بن، هەموویان بە یەك کۆمەڵ هەژمار دەکرێن.

## بَابٌ فِي لُزُومِ السُّنَّةِ

### باسێك دەربارەی پابەندبوون بە سوننەتەوە

**٧٦٥. عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي رَافِعٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِهِ يَأْتِيهِ الْأَمْرُ مِنْ أَمْرِي مِمَّا أَمَرْتُ بِهِ أَوْ نَهَيْتُ عَنْهُ فَيَقُولُ لَا نَدْرِي مَا وَجَدْنَا فِي كِتَابِ اللَّهِ اتَّبَعْنَاهُ».**

عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو ڕافیع، لە باوکییەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «با کەسی وا نەبینم پاڵی دابێتەوە لەسەر لایەکانی و لەسەر جێگای ڕازاوە، فەرمانی بۆ بێت لەو شتانەی کە من فەرمانم پێ کردووە لە کاروباری دیندا، یان لەوەی کە من ڕێگریم لێ کردووە، بڵێت: نازانم شتی وام نەبیستووە ئێمە ئەوەی لە قورئاندا هەبێت شوێن قورئان دەکەوین (شوێن سوننەت ناکەوین)».

**٧٦٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَلَا هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ».**

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ئاگادار بن ئەوانەی کە ڕۆدەچن لە شتدا، زێدەڕۆیی دەکەن (سنوور دەبەزێنن لە وتە و لە کردەوەدا)، ئەوانە تیا چوون».

تێبینی:

مەبەست قووڵبوونەوە و زێدەڕۆیی لە شتی پووچ، کە ئەو کەسە تەکلیفی ئەوەی لێ

نەکراوە، ئەگەرنا مەبەستی ئەوە نییە مرۆڤ بیر لە هیچ نەکاتەوە و بەدوای حیکمەت و زانیاری وردد ا نەگەڕێت، نەخێر، ئەوە فەرمانی پێ کراوە کە ئەنجام بدرێت.

## بَابُ مَنْ دَعَا إِلَى السُّنَّةِ

### باسی ئەو کەسەی بانگەوازی خەڵك بکات بۆ ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ

٧٦٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى كَانَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلَالَةٍ كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الْإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك خەڵکی بەرەو هیدایەت بانگ بکات، بەئەندازەی هەموو ئەوانەی کە شوێنی کەوتوون پاداشتی هەیە، بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتی ئەوانیش کەم ببێتەوە، هەر کەسێك خەڵکی بەرەو گومڕایی بانگ بکات، ئەوە بەئەندازەی هەموو ئەوانەی شوێنی کەوتوون گوناهی هەیە، بێ ئەوەی هیچ لە گوناهی ئەوانیش کەم ببێتەوە».

تێبینی:

واتە: هەر کەسێك بەرچاوی خەڵکی ڕوون بکاتەوە بەرانبەر بە بەرنامەی خوا، هەروەها خەڵکی فێری زانست و زانیاری بکات، ئەوە پاداشتی ئەوانەشی بۆ دێت کە شوێنی دەکەون، بێ ئەوەی لە پاداشتی خۆیان کەم ببێتەوە، پێچەوانەکەشی بە پێچەوانەوەیە.

٧٦٨. عَنْ سَعْدٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَعْظَمَ الْمُسْلِمِينَ فِي الْمُسْلِمِينَ جُرْمًا، مَنْ سَأَلَ عَنْ أَمْرٍ لَمْ يُحَرَّمْ فَحُرِّمَ عَلَى النَّاسِ، مِنْ أَجْلِ مَسْأَلَتِهِ».

سەعد ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «گەورەترین تاوانباری موسوڵمانان کەسێکە کە پرسیار لە شتێك بکات کە حەرام نەکرابێت بەهۆی پرسیارەکەی ئەوەوە لەسەر خەڵك حەرام بکرێت».

تێبینی:

ئەم فەرموودەیە بۆ کاتی ڕۆژگاری پێغەمبەری خوایە ﷺ کە ئایەت دادەبەزی، ئێستا حەڵاڵ و حەڕام کۆتایی هاتووە، بەڵام ئەو کاتە ئەگەر کەسێك پرسیاری کردبێت لە شتێك و بەهۆی ئەوەوە ئەو شتە حەرام کرابێت، ئەوە تاوانێکی گەورەی بەرانبەر موسوڵمانان ئەنجام داوە، بەڵام ئەو پرسیارانەی سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی ئایینە و صەحابە پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە ئەوە ناگرێتەوە، بەڵام پرسیارێکە بۆ ڕۆچوون و زێدەڕۆییە لە شتێکدا پێویست نییە، هەر زۆر پرسیار دەکات هەتا شتەکە حەرام دەبێت، بەبێ ئەوەی پێویست بێت و گرینگ بێت ئەوە دەیگرێتەوە.

## بَابٌ فِي الْخُلَفَاءِ

## باسێك دەربارەی جێنشینەکان

٧٦٩. عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ ذَاتَ يَوْمٍ: «مَنْ رَأَى مِنْكُمْ رُؤْيَا؟». فَقَالَ رَجُلٌ: أَنَا، رَأَيْتُ كَأَنَّ مِيزَانًا نَزَلَ مِنَ السَّمَاءِ فَوُزِنْتَ أَنْتَ وَأَبُو بَكْرٍ فَرَجَحْتَ أَنْتَ بِأَبِي بَكْرٍ، وَوُزِنَ عُمَرُ وَأَبُو بَكْرٍ، فَرَجَحَ أَبُو بَكْرٍ، وَوُزِنَ عُمَرُ وَعُثْمَانُ، فَرَجَحَ عُمَرُ ثُمَّ رُفِعَ الْمِيزَانُ، فَرَأَيْنَا الْكَرَاهِيَةَ فِي وَجْهِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

ئەبو بەکرە ﷺ دەگێڕێتەوە: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «کێ لە ئێوە خەونێکی بینیوە؟»، پیاوێك گوتی: من، (گوتی:) بینیم لە ئاسمانەوە شتێك وەکوو تەرازوو دابەزی، ئیدی جەنابت و ئەبو بەکر کێشران، تۆ لە سەرووی ئەوەوە بوویت، هەروەها عومەر

و ئەبو بەکر کێشران، ئەبو بەکر قورِستر بوو، عومەر و عوسمان کێشران، عومەر قورِستر بوون، پاشان تەرازووەکە هەڵگیرایەوە، لەو کاتەدا بە ڕوخساری زانیمان کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێیناخۆش بوو. (پێدەچێت مەبەستی ئەوە بووبێت کە خیلافەتی بێ کێشە و گیروگرفت زوو کۆتایی دێت، بۆیە پێیناخۆش بووە).

**٧٧٠. عَنْ سَفِينَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خِلَافَةُ النُّبُوَّةِ ثَلَاثُونَ سَنَةً، ثُمَّ يُؤْتِي اللَّهُ الْمُلْكَ مَنْ يَشَاءُ، أَوْ مُلْكَهُ مَنْ يَشَاءُ».**

سەفینە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خیلافەت لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرایەتی سی (٣٠) ساڵە، پاشان خوای گەورە موڵك بە هەر کەسێك دەدات کە ویستی لێ بێت».

تێبینی:

سی (٣٠) ساڵەکە:

جێنشینایەتی پێشەوا ئەبو بەکر ﵁: (٢) ساڵ و (٣) مانگ و (١٠) ڕۆژ بووە.

جێنشینایەتی پێشەوا عومەر ﵁: (١٠) ساڵ و (٥) مانگ و (٢١) ڕۆژ بووە.

جێنشینایەتی پێشەوا عوسمان ﵁: (١١) ساڵ و (١١) مانگ و (٩) ڕۆژ بووە.

جێنشینایەتی پێشەوا عەلی ﵁: (٤) ساڵ و (٩) مانگ و (٧) ڕۆژ بووە.

جێنشینایەتی پێشەوا حەسەنیش نزیکەی (٧) مانگ، ئەمە هەمووی سی (٣٠) ساڵ و چەند مانگێك دەکات، ئەمە جێنشینایەتی پێغەمبەرایەتی ﷺ بووە.

## بَابٌ فِي فَضْلِ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

### باسێك دەربارەی پێگە و گەورەیی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ

**٧٧١. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ أُمَّتِي الْقَرْنُ الَّذِينَ بُعِثْتُ فِيهِمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، -وَاللَّهُ أَعْلَمُ أَذَكَرَ الثَّالِثَ أَمْ لَا-، ثُمَّ يَظْهَرُ قَوْمٌ يَشْهَدُونَ، وَلَا يُسْتَشْهَدُونَ، وَيَنْذِرُونَ، وَلَا يُوفُونَ، وَيَخُونُونَ، وَلَا يُؤْتَمَنُونَ، وَيَفْشُو فِيهِمُ السِّمَنُ».**

عیمرانی کوڕی حوصەین ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترینی ئوممەتەکەم ئەوانەن کە من تێیاندا نێردراوم، پاشان ئەوانەی دوای ئەوان، ئنجا ئەوانەی دوای ئەوان، -خوا زاناترە نازانم سێیەمی باس کرد یان نا-، پاشان کەسانێك پەیدادە بن شایەتی دەدەن بێ ئەوەی داوای شایەتییان لێ بکرێت[1]، نەزر دەکەن و جێبەجێی ناکەن و ناپاکی دەکەن و دەستپاك نین، قەڵەوی تیایاندا دەردەکەوێت».

## بَابٌ فِي النَّهْيِ عَنْ سَبِّ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

### باسێك دەربارەی ڕێگریکردن لە جنێودان بە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ

**٧٧٢. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنْفَقَ أَحَدُكُمْ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ».**

ئەبو سەعید ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جنێو مەدەن بە هاوەڵانم، سوێند بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر یەکێك لە ئێوە بەئەندازەی کێوی

---

(١) بەڵام ڕیوایەتی دیکە کە دەفەرموێت: باشترین شایەت ئەوەیە کە شایەتی دەدات پێش ئەوەی داوای لێ بکرێت، ئەمە بۆ ئەوەیە هەقێك نەفەوتێت، بەڵام ئەمیان شتەکە زانراوە داوای لێ نەکراود لەخۆیەوە شایەتی دەدات.

ئوحود ئاڵتوون ببەخشێت، ناگاتە ئەوەی ئەوان کە مشتێك، یان نیو مشت ببەخشن».

## بَابُ مَا يَدُلُّ عَلَى تَرْكِ الْكَلَامِ فِي الْفِتْنَةِ

باسی ئەوەی کە بەڵگەیە لەسەر (پەسندی) بێدەنگبوون لە کاتی ئاشووبدا

٧٧٣. عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ: «إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ، وَلَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يُصْلِحَ بِهِ بَيْنَ فِئَتَيْنِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ عَظِيمَتَيْنِ».

ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە حەسەنی کوڕی عەلی ﷺ فەرموو: «ئەم کوڕەی من پیاوێکی گەورەی لێ دەردەچێت و ئومێد دەکەم خوای گەورە چاکسازی و ئاشتەوایی بکات لەسەر دەستی ئەم لە نێوان دوو کۆمەڵی گەورە لە موسوڵمانان».

## بَابٌ فِي الْقَدَرِ

باسێك دەربارەی قەدەر

٧٧٤. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قِيلَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَعُلِمَ أَهْلُ الْجَنَّةِ مِنْ أَهْلِ النَّارِ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، قَالَ: فَفِيمَ يَعْمَلُ الْعَامِلُونَ؟ قَالَ: «كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ».

عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا دەزانرێت کێ بەهەشتییە و کێ دۆزەخییە؟ فەرمووی: «بەڵێ»، (یەکێك) گوتی: ئیدی خەڵك بۆ کار دەکات؟ فەرمووی: «هەموو کەسێك بۆچی دروست کرابێت، کردەوەی ئەو شوێنەی بۆ ئاسان کراوە».

## بَابٌ فِي ذَرَارِيِّ الْمُشْرِكِينَ

### باسێك دەربارەی منداڵی هاوبەشدانەران

٧٧٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ مَوْلُودٍ يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ، فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ وَيُنَصِّرَانِهِ، كَمَا تَنَاتَجُ الْإِبِلُ مِنْ بَهِيمَةٍ جَمْعَاءَ، هَلْ تُحِسُّ مِنْ جَدْعَاءَ؟»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَرَأَيْتَ مَنْ يَمُوتُ وَهُوَ صَغِيرٌ؟ قَالَ: «اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِينَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەموو منداڵێک لەسەر سروشتی خواپەرستی و خواناسی لەدایک دەبێت، دوایی دایک و باوکی دەیکەنە جوولەکە، یان دەیکەنە نەسرانی، (یان دەیکەنە ئاگرپەرست)، (وێنە دێنێتەوە و دەفەرموێت:) وەک چۆن بەچکەی ئاژەڵ کە لەدایک دەبێت، بەسەلامەتی لەدایک دەبێت، ئایا هیچ دەبینن گوێی بڕابێت، یاخود داخ کرابێت؟ (نەخێر، بەڵکوو دوایی مرۆڤ دەستکاری دەکات)»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵمان پێ بدە بە حاڵی ئەو منداڵانە کە بە بچووکی دەمرن سەرەنجامیان چییە؟ فەرمووی: «خوا زاناترە داخۆ (ئەگەر گەورە بوونایە) چ کردەوەیەکیان دەکرد».

## بَابٌ فِي الرُّؤْيَةِ

### باسێك دەربارەی بینینی خوا لە ڕۆژی دوایی

٧٧٦. عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ جُلُوسًا، فَنَظَرَ إِلَى الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ لَيْلَةَ أَرْبَعَ عَشْرَةَ، فَقَالَ: «إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا لَا تُضَامُّونَ فِي رُؤْيَتِهِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لَا تُغْلَبُوا عَلَى صَلَاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ

وَقَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا»، ثُمَّ قَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ: «{فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا} طه: ١٣٠».

جەریری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبووین، تەماشای مانگی چواردەی کرد، فەرمووی: «ئێوە پەروەردگارتان دەبینن (لە ڕۆژی قیامەتدا) هەر وەکوو چۆن ئەم مانگە دەبینن کە پێویستتان بە قەرەباڵغیکردن نییە، ئەگەر توانیتان شەیتان بەسەرتاندا زاڵ نەبێت بۆ نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر، ئەم نوێژانە لە سەرەتای کاتەکەیدا بکەن»، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: «{فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا}، واتە: خوا بەپاك بگرە و سوپاس و ستاییشی بکە (واتە: نوێژ بکە) لەپێش خۆهەڵاتن و لەپێش خۆرئاوابوون».

## بَابٌ فِي الْقُرْآنِ

### باسێك دەربارەی قورئان

٧٧٧. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعْرِضُ نَفْسَهُ عَلَى النَّاسِ فِي الْمَوْقِفِ، فَقَالَ: «أَلَا رَجُلٌ يَحْمِلُنِي إِلَى قَوْمِهِ، فَإِنَّ قُرَيْشًا قَدْ مَنَعُونِي أَنْ أُبَلِّغَ كَلَامَ رَبِّي».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی پیشانی خەڵکی دەدا لە مەوقیفدا (شوێنێکە لە مەککە)، فەرمووی: «ئایا پیاوێك هەیە بمباتەوە بۆ لای قەومەکەی پەنام بدات، لەبەر ئەوەی قوڕەیش ڕێگریم لێ دەکەن فەرمایشتی پەروەردگارم بگەیەنم».

## بَابٌ فِي الشَّفَاعَةِ

### باسێك دەربارەی تكاكردن (الشفاعة)

٧٧٨. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «شَفَاعَتِي لِأَهْلِ الْكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي».

ئەنەسی كوڕی مالیك ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «تكاكاریی من (لە قیامەتدا) ئەوانەش دەگرێتەوە كە گوناهی گەورەیان هەیە».

٧٧٩. عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ يَأْكُلُونَ فِيهَا وَيَشْرَبُونَ».

جابیر ﷺ دەڵێت: گوێم لێ بوو پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: «بەهەشتییەكان لە بەهەشتدا دەخۆن و دەخۆنەوە».

## بَابٌ فِي ذِكْرِ الْبَعْثِ وَالصُّورِ

### باسێك دەربارەی زیندووبوونەوە و فووكردن بە كەڕەنادا

٧٨٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُّ ابْنِ آدَمَ تَأْكُلُ الْأَرْضُ، إِلَّا عَجْبَ الذَّنَبِ مِنْهُ خُلِقَ وَفِيهِ يُرَكَّبُ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زەوی هەموو لاشەی ئادەمیزاد دەخوات جگە لە كلێنچە، مرۆڤ لەوە دروست كراوە و دواتریش لەوە دروست دەكرێتەوە».

تێبینی:

پێغەمبەرانی خوا صەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت، وەكوو خۆیان لاشەیان

دەمێنێتەوە، خوای گەورە حەرامی کردووە لەسەر زەوی لاشەی پێغەمبەران بڕزێنێت و بخوات.

## بَابٌ فِي الْمَسْأَلَةِ فِي الْقَبْرِ وَعَذَابِ الْقَبْرِ

## باسێك دەربارەی پرسیاری نێو گۆڕ و سزای گۆڕ

٧٨١. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا سُئِلَ فِي الْقَبْرِ فَشَهِدَ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَذَلِكَ قَوْلُ اللَّهِ ﷻ: {يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ} إبراهيم: ٢٧».

بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێك موسوڵمان لەنێو گۆڕدا پرسیاری لێ دەکرێت، ئەگەر ئەویش وەڵامی دایەوە، شایەتی بدات بە (لا إله إلا الله)، بە محمد (رسول الله ﷺ)، ئەوە مانای ئەم ئایەتەی خوای گەورەیە ﷻ کە دەفەرموێت: {يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالْقَوْلِ الثَّابِتِ}، واتە: خوا بڕواداران جێگیر دەکات بە وتەی جێگیر کە وتەی (لا إله إلا الله)یە لە ژیانی دونیا و لە قیامەتیشدا کە مەبەست پێی نێو گۆڕە».

٧٨٢. عَنْ عَرْفَجَةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «سَتَكُونُ فِي أُمَّتِي هَنَاتٌ، وَهَنَاتٌ، وَهَنَاتٌ، فَمَنْ أَرَادَ أَنْ يُفَرِّقَ أَمْرَ الْمُسْلِمِينَ وَهُمْ جَمِيعٌ فَاضْرِبُوهُ بِالسَّيْفِ كَائِنًا مَنْ كَانَ».

عەرفەجە ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «لەنێو ئوممەتی مندا خراپە و ئاژاوەگێڕی دەبێت و خراپە و ئاژاوەگێڕی دەبێت و خراپە و ئاژاوەگێڕی دەبێت، هەر کەسێك ویستی جیاوازی بخاتە نێوان موسوڵمانانەوە، ڕیزی موسوڵمانان پارچە پارچە بکات لە کاتێکدا یەك ڕیزن، ئەوە بە شمشێر لێی

بدەن، جا ئەو کەسە هەر کەسێك بێت».

## بَابٌ فِي قِتَالِ اللُّصُوصِ

### باسێك دەربارەی جەنگان لەگەڵ دز

٧٨٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أُرِيدَ مَالُهُ بِغَيْرِ حَقٍّ فَقَاتَلَ فَقُتِلَ فَهُوَ شَهِيدٌ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێك خەڵکی ویستی ماڵەکەی بەناهەق ببات، ئەمیش شەڕی لەسەر کرد لەپێناو ماڵەکەیدا کوژرا، ئەوە شەهیدە».

٧٨٤. عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ، أَوْ دُونَ دَمِهِ، أَوْ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ».

سەعیدی کوڕی زەید ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێك لەپێناوماڵیدا بکوژرێت شەهیدە، هەر کەسێك لەپێناو بەرگریکردن لە ناموسیدا (خێزانی یان کچی یان خزمێکی نزیکی، بیانەوێت دەستدرێژی بکەنە سەریان، بەرگری بکات و بکوژرێت شەهیدە)، هەر کەسێك لەپێناو خوێنیدا بکوژرێت شەهیدە، هەر کەسێك لە پێناوی ئایینەکەیدا بکوژرێت شەهیدە».

# كِتَابُ الْأَدَبِ

## پەرتووكی ئەدەب

### بَابٌ فِي الْحِلْمِ وَأَخْلَاقِ النَّبِيِّ ﷺ

### باسێك دەربارەی نەرمونیانی و ڕەوشتجوانی پێغەمبەر ﷺ

٧٨٥. عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: خَدَمْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَشْرَ سِنِينَ بِالْمَدِينَةِ وَأَنَا غُلَامٌ لَيْسَ كُلُّ أَمْرِي كَمَا يَشْتَهِي صَاحِبِي أَنْ أَكُونَ عَلَيْهِ مَا قَالَ لِي فِيهَا: «أُفٍّ قَطُّ»، وَمَا قَالَ لِي: «لِمَ فَعَلْتَ هَذَا»، أَوْ: «أَلَّا فَعَلْتَ هَذَا».

ئەنەس رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەڵێت: دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم ﷺ كرد لە مەدینەدا، من منداڵ بووم، هەموو شتێكیش لەو خزمەتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەمكرد بەم شێوازە نەبووە كە پێغەمبەری خوا ﷺ پێی ڕازی بێت، (بێگومان هەڵەم هەبووە، بەڵام) هەرگیز پێمی نەفەرمووە: «ئۆف لە دەستت»، یان پێمی نەفەرمووە: «بۆ ئەم ئیشەت كرد»، یان: «بۆ ئەم ئیشەت نەكرد»[1].

---

(١) واتە: هەموو ئیشەكانیشم بەگوێرەی ویستی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبووە، بەڵام هەرگیز گلەیی و گازندەشی نەكردووە، كە ئەمە ڕەوشت جوانی پێغەمبەری خوایە ﷺ لە ماوەی دە ساڵدا گلەیی لە كەسێك نەكردووە!

## بَابُ مَا يُقَالُ عِنْدَ الْغَضَبِ

### باسی ئەوەی دەگوترێ لە کاتی تووڕەییدا

٧٨٦. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ لَنَا: «إِذَا غَضِبَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ قَائِمٌ فَلْيَجْلِسْ، فَإِنْ ذَهَبَ عَنْهُ الْغَضَبُ وَإِلَّا فَلْيَضْطَجِعْ».

ئەبو زەڕ ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووین: «ئەگەر یەکێك لە ئێوە تووڕە بوو، بەپێوە بوو با دابنیشێت، ئەگەر تووڕەبوونەکەی ڕۆیشت باشە، ئەگەرنا با پاڵ بکەوێت».

## بَابُ فِي التَّجَاوُزِ فِي الْأَمْرِ

### باسێك دەربارەی لێبووردەیی و ئاسانکاری

٧٨٧. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي أَمْرَيْنِ إِلَّا اخْتَارَ أَيْسَرَهُمَا، مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا، فَإِنْ كَانَ إِثْمًا كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ، وَمَا انْتَقَمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِنَفْسِهِ، إِلَّا أَنْ تُنْتَهَكَ حُرْمَةُ اللَّهِ تَعَالَى فَيَنْتَقِمُ لِلَّهِ بِهَا.

دایکمان عائیشە ﵂ دەڵێت: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ سەرپشك نەکراوە لە نێوانی دوو شتاندا حەتمەن کامەی ئاسانە ئەوەی هەڵبژاردوە مادام گوناح نەبووبێت، ئەگەر گوناهیش بووبێت، ئەوە لە هەموو خەڵکی لێی دوورتر بووە، هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ نەفسی خۆی تۆڵەی نەسەندۆتەوە، تەنها (کاتێك تۆڵەی سەندۆتەوە) ئەگەر سنوور و حەرامکراوەکانی خوای بەرز بەزێنرابن، ئەوکات تۆڵەی وەرگرتۆتەوە بۆ خوا.

٧٨٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا ضَرَبَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَادِمًا وَلَا امْرَأَةً قَطُّ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ نە لە خزمەتکارێکی داوە، نە لە خێزانێك لە خێزانەکانی داوە.

## بَابٌ فِي حُسْنِ الْعِشْرَةِ

## باسێك دەربارەی جوان مامەڵەکردن

٧٨٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا بَلَغَهُ عَنِ الرَّجُلِ الشَّيْءُ لَمْ يَقُلْ: «مَا بَالُ فُلَانٍ يَقُولُ؟»، وَلَكِنْ يَقُولُ: «مَا بَالُ أَقْوَامٍ يَقُولُونَ كَذَا وَكَذَا؟».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر کارێکی نابەجێی لە کەسێکەوە پێ بگەیشتایە، نەیدەیفەرموو: «ئەمە فڵانە کەس بۆ ئەم قسەیەی کردووە، یان بۆ ئەم کردەوەی کردووە؟»، بەڵکوو دەیفەرموو: «چییە ئەوە کەسانێك وا دەڵێن و وا دەڵێن؟».

٧٩٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «بِئْسَ ابْنُ الْعَشِيرَةِ»، أَوْ «بِئْسَ رَجُلُ الْعَشِيرَةِ»، ثُمَّ قَالَ: «ائْذَنُوا لَهُ». فَلَمَّا دَخَلَ أَلَانَ لَهُ الْقَوْلَ، فَقَالَتْ عَائِشَةُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَنْتَ لَهُ الْقَوْلَ وَقَدْ قُلْتَ لَهُ مَا قُلْتَ، قَالَ: «إِنَّ شَرَّ النَّاسِ عِنْدَ اللَّهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ وَدَعَهُ، أَوْ تَرَكَهُ، النَّاسُ لِاتِّقَاءِ فُحْشِهِ».

عائیشە ﵂، دەڵێت: پیاوێك داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «(مۆڵەتی بدەن، بەڵام) ئەمە خراپترین کەسی عەشیرەتەکەی خۆیەتی»، یان:«ئەمە خراپترین پیاوی عەشیرەتەکەی خۆیەتی»، دوایی فەرمووی: «مۆڵەتی بدەن»، کاتێك هاتە ژوورەوە پێغەمبەر ﷺ نەرمی لەگەڵیدا نواند، بەنەرمی قسەی لەگەڵ کرد، عائیشە ﵂ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ نەرمیت لەگەڵدا نواند، کەچی پێشتریش ئەوەی کە فەرمووت (دەربارەی) فەرمووت، فەرمووی: «خراپترین کەس لە ڕۆژی قیامەت لای خوا کەسێکە کە خەڵك وازی لێ بێنێت و

خۆی لێ بپارێزێت بۆ خۆپاراستن لە خراپییەکانی».

## بَابٌ فِي الْحَيَاءِ

### باسێك دەربارەی شەرم و شکۆ

٧٩١. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِمَّا أَدْرَكَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِ النُّبُوَّةِ الْأُولَى إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَافْعَلْ مَا شِئْتَ».

ئەبو مەسعوود ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەوەی کە خەڵکی پێی گەیشتووە لە قسەی پێغەمبەرانی سەرەتا (ئەم شتەیان بۆ ماوەتەوە دەستاودەست و دەماودەم کە ئەمە قسەی پێغەمبەرانە) ئەگەر هاتو شەرمت نەکرد، ئەوە هەرچییەك دەکەیت بیکە».



## بَابٌ فِي حُسْنِ الْخُلُقِ

### باسێك دەربارەی ڕەوشتجوانی

٧٩٢. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ الْمُؤْمِنَ لَيُدْرِكُ بِحُسْنِ خُلُقِهِ دَرَجَةَ الصَّائِمِ الْقَائِمِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «کەسی وا هەیە لە بڕواداران بە ڕەوشتجوانی دەگاتە پلەی کەسێك کە بە ڕۆژ بەڕۆژوو بێت و بە شەو شەونوێژ بکات».

٧٩٣. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَلُ فِي الْمِيزَانِ مِنْ

حُسْنِ الْخُلُقِ».

ئەبو دەرداء ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «لە تەرازووی کردەوە چاکەکاندا هیچ شتێك قورستر نییە لە ڕەوشتجوانی».

## بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ التَّمَادُحِ

### باسێك دەربارەی ناپەسندی مەدحی ڕووبەڕوو

٧٩٤. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً أَثْنَى عَلَى رَجُلٍ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ لَهُ: «قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ»، ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ قَالَ: «إِذَا مَدَحَ أَحَدُكُمْ صَاحِبَهُ لَا مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ: إِنِّي أَحْسِبُهُ، كَمَا يُرِيدُ أَنْ يَقُولَ، وَلَا أُزَكِّيهِ عَلَى اللَّهِ».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە، لە باوکییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێك لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ مەدح و سەنای پیاوێکی دیکەی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەوە ملی براکەت بڕی»، سێ جار وای فەرموو، پاشان فەرمووی: «ئەگەر کەسێك لە ئێوە مەدح و سەنای براکەی خۆی کرد و چار نەبوو هەر دەیویست مەدحی بکات، با بڵێت: من وا گومان دەبەم ئەم کەسە وا بێت، هەر وەکوو پێویستە بڵێت: کەس بەپاك ناگرم لە سەرووی خواوە (خوا زاناترە بە بەندەکان)».

## بَابٌ فِي الرِّفْقِ

### باسێك دەربارەی نەرمونیانی

٧٩٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ رَفِيقٌ: يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَيْهِ مَا لَا يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ».

عەبدوڵڵای كوڕی موغەففەل ﷛ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان خوا نەرمونیانە لەگەڵ بەندەكانی، نەرمونیانی خۆش دەوێت، ئەوەی بە نەرمونیانی دەبەخشێت، بە توندوتیژی نابەخشێت».

٧٩٦. عَنْ شُرَيْحٍ ﷛ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂ عَنِ الْبَدَاوَةِ، فَقَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَبْدُو إِلَى هَذِهِ التِّلَاعِ، وَإِنَّهُ أَرَادَ الْبَدَاوَةَ مَرَّةً فَأَرْسَلَ إِلَيَّ نَاقَةً مُحَرَّمَةً مِنْ إِبِلِ الصَّدَقَةِ، فَقَالَ لِي: «يَا عَائِشَةُ، ارْفُقِي فَإِنَّ الرِّفْقَ لَمْ يَكُنْ فِي شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا زَانَهُ، وَلَا نُزِعَ مِنْ شَيْءٍ قَطُّ إِلَّا شَانَهُ».

شورەیح ﷛ دەڵێت: پرسیارم كرد لە خاتوو عائیشە ﵂ دەربارەی دەرچوون بۆ بادییە (مانەوە لە دەشتدا)، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەردەچوو بۆ لای تیلاع، ڕۆژێكیان پێغەمبەری خوا ﷺ ویستی دەربچێت بۆ دەرەوە وشترێكی بۆ ناردم لەو وشترانەی كە بۆ سواری بەكار نەهێنرابوون، وشتری صەدەقە بوو، پێمی فەرموو: «ئەی عائیشە، نەرمونیان بە، بەڕاستی نەرمونیانی لە هەر شتێكدا هەبێت جوانی دەكات، لە هەر شتێكیشدا دابڕنرێت ناشیرینی دەكات».



✎ تێبینی:

(التِّلَاعِ): یانی ڕێڕەوی ئاو لە سەرەوە بۆ خوارەوە، كە ئاو دێتە خوارەوە، دەچووە ئەو شوێنانە.

## بَابٌ فِي شُكْرِ الْمَعْرُوفِ

## باسێك دەربارەی سوپاسكردنی چاكەكار

٧٩٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَشْكُرُ اللَّهَ مَنْ لَا يَشْكُرُ النَّاسَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «سوپاسی خوا ناكات، ئەو كەسەی سوپاسی خەڵك نەكات».

٧٩٨. عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﷺ قَالَ: كُنَّا إِذَا أَتَيْنَا النَّبِيَّ ﷺ، جَلَسَ أَحَدُنَا حَيْثُ يَنْتَهِي.

جابیری كوڕی سەمورە ﷺ دەڵێت: كاتێك یەكێكمان دەچووینە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، كۆتا ڕیزی دانیشتن لە كوێ بووایە لەوێ دادەنیشتین.

## بَابُ مَنْ يُؤْمَرُ أَنْ يُجَالِسَ

### باسی ئەوەی كە فەرمان كراوە مرۆڤ هاونشینی كێ بێت



٧٩٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْأَرْوَاحُ جُنُودٌ مُجَنَّدَةٌ، فَمَا تَعَارَفَ مِنْهَا ائْتَلَفَ، وَمَا تَنَاكَرَ مِنْهَا اخْتَلَفَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕووحەكان كۆمەڵێك سەربازی مەشقپێكراون ئەوەندەی كە یەكدی دەناسن هۆگری یەكدی دەبن، ئەوەندەیشی كە یەكدی نەناسن و لەیەك دوور بن، جیاوازی دەكەوێتە نێوانیانەوە و هۆگری یەكدی نابن».

## بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ الْمِرَاءِ

### باسێك دەربارەی ناپەسندییەتی مشتومڕ و شەڕەقسە

٨٠٠. عَنْ أَبِي مُوسَى ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: إِذَا بَعَثَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِهِ فِي بَعْضِ أَمْرِهِ قَالَ: «بَشِّرُوا وَلَا تُنَفِّرُوا، وَيَسِّرُوا وَلَا تُعَسِّرُوا».

